دەق

# هستریای وشە
# و
# حونجەی بێدەنگی

ستیڤان شەمزینی

٢٠٢١

# هستریای وشە و
# حونجەی بێدەنگی


بابەت: دەق
نووسینی: ستیڤان شەمزینی
دیزاین: هەرێم عوسمان
چاپ: چاپخانەی کارۆ - سلێمانی
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
نرخ: ٥٠٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرێتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە سپاردنی (١٩٨٤) ی ساڵی ٢٠٢١ ی پێدراوە

١

من مرۆڤێکی دوو دیوم
دیوێکم بە ئاشکرا پێدەکەنی
دیوەکەی تریشم
بەنهێنی دەگریێ

٢

هەتا لە خۆمان تێنەگەین
ناتوانین لە ژیان تێبگەین
کەسیشم نەدیوە
لە خۆی تێبگات

٣

تەمەنم هەشت ساڵ دەبوو
منداڵانی گەڕەک
وەک شێت بەردیان تێدەگرت
دەیانووت پێشتر عاشق بووە

٤

لەناو ئەو خێڵە قەرەجەی
لە بۆداپێستەوە بۆ پاریس دەچوون
چاوم بۆ خۆم دەگێڕا

٥

سالانێکی زۆر
داوای ژیریم لە مرۆڤ دەکرد
بیرم چوو بوو
مەحکومە بە دەبەنگیی

٦

دیموکراسی
کاریگەرترین حەشیشە
بۆ وڕکردنی مرۆڤایەتی

٧

هەموو ژیانم
بۆ تێکۆشان تەرخان کرد
بۆ ئەوەی ببم بە خۆم

٨

دوای پەنجا ساڵ بەسەر مردنیدا
وەڵامێک بۆ نامەکەی باپیرم:
جەنابی یا شێخ
هێشتا نۆبەتی شادیی
نەهاتووەتە سەر ئێمە

٩

بانگەوازێک بۆ خۆم:
ڕاستە شەقامی خۆت بگرە
هەوڵمەدە بچیتە سەر جادەی کەس

١٠

شاعیرەکان
لە هەموو شوێنێکن و
لە هیچ جێگەیەکیش نابینرێن
لەنێو ئۆقیانووسی خەیاڵدا
مەلە دەکەن

١١

کە لە نیشتمانەوە گەڕامەوە ئێرە
جانتای سەفەرەکەم کردەوە
هیچم لە وڵات بیر نەچوو بوو
جگە لە خۆم

١٢

هەمیشە لە ژوورەوەم
لە ژووری ژوورەوەم
حەزم لەوە نییە
لە خۆم بێمە دەرەوە

١٣
تیرۆرم دەکەن
نەک بەهۆی ئەو وشانەی وتوومن
بەڵکو لە ترسی ئەو دێڕانەی
هێشتا نەموتوون
١٤
دیموکراسی
باشترین سیستمە
بۆ دابینکردنی مافی هەجو
١٥
ڕۆژەکانمان هێندە لێکدەچن
ئەمڕۆمان کۆپی دوێنێ
سبەینێشمان کۆپی ئەمڕۆیە
١٦
کەس لەسەر هیچ نەوتن
لێپرسینەوەی لەگەڵ نەکراوە
جگە لە من
١٧
هیچ خۆکوژێک نییە
جارێک ژیان و
جارێکی تر خۆشەویستی
دڵیان نەشکاندبێ

١٨
هەر کاتێ کتێبێکی سیاسیی دەخوێنمەوە
ناچار بە دوایدا
کتێبێکی شیعریش دەخوێنمەوە
بۆ ئەوەی غوسڵی مێشک پیسبوون دەربکەم
١٩
چارەگە سەدەیەک پێش ئێستا
"پێکەنینی گەدا"م خوێندەوە[١]
لەوساوە دەزانم
هەژارەکان بە گریانەوە پێدەکەنن
٢٠
تەنانەت مردنیش دادپەوەر نییە
بۆ ئەوەی دیکتاتۆرێک لەناو بچێ
مەرجی هەزاران قوربانی داناوە
٢١
خاڵی لاوازم ئەوەیە
زۆر زوو دڵم دەکەمەوە
کە دەمەوێ کڵۆمی بدەم
کاتەکە درەنگ بووە

---

[١] مەبەست لە کۆچیرۆکی "پێکەنینی گەدا"ی "حەسەن قزلجی"یە، کە بە دەستپێکی کورتە چیرۆک لە رۆژهەلاتی کوردستان مەزندە کراوە.

٢٢

زۆر رقم لەم وشەیەیە:

"دنیای بەرین"

کۆرۆنا ڤیرۆس

هیچی فێر نەکردبین

پێی وتین دنیا چەند تەسکە

٢٣

چ گاڵتەوگەپێکە

کۆیلەکانی سەدەی بیستەم

لە سەدەی بیست و یەکدا

وانەبێژی ئازادین!

٢٤

دیموکراسی

یەک شت لە فاشیزم

جیای کردووەتەوە

من بۆ ئەو خاڵە دەگەڕێم

٢٥

ئەگەر ئاینەکان نەمێنن

دەبێت دەرگای دۆزەخیش

بۆ هەمیشە قەپات بکرێ

٢٦
دانتێ[١]
کۆمیدیای خواوەندی نوسی
رەنگە کاتی هاتبێ
یەکێکیش پەیدا بێ
کۆمیدیای مرۆڤایەتی بنووسێ
٢٧
زۆرجار هاورێ ئاتەیستەکانم
گریمانەی لەناوچوونی ئاین دەکەن
بێ ئاگا لەوەی
زانست ئاینێکی جاویدانی داهێناوە
بە ناوی ماتریاڵ
٢٨
هەموو جار
بێ کێشەیی خۆی کێشەیەکە
هیچ کێشەیەکیش نییە
لەو گەورەتر بێ

---

[١] دانتی ئەلیگیری ١٢٦٥-١٣٢١ نووسەر و شاعیری ئیتالی، نووسەری "کۆمیدیای یەزدانی" لە سی بەشدا.

٢٩
داهێنان
خوڵقاندن نییە لە هیچەوە
تەنیا زیادکردنە
هەروەک ئەوەی زریاب[١]
لەگەڵ عود کردی
٣٠
شیعرێکم نوسیووە
بۆم ناخوێنرێتەوە
لە واتاکانی تێناگەم
دوو سەدەی تر
مرۆڤگەلێک پەیدا دەبن لێکی بدەنەوە
٣١
شێرکۆ بێکەس
تا مرد دەستی لە ژیان نەدەبووەوە
ژەنەراڵی پایزیش
هەموو ژیانی پاڕانەوە بوو لە مەرگ
هیچیان ناهەق نەبوون

---

[١] زریاب، کۆیلەیەکی کۆشکی هارونە رەشید بوو، بە زیادکردنی "ژێ"یەک بۆ ئامێری عود، توانی رینسانیک لە موزیکدا دروست بکات.

٣٢
لە قوڕی نیگەرانیدا چەقیوم
نیگەرانیی لە قوڕی مندا چەقیوە
من و نیگەرانیی ،
لە قوڕی یەکتردا چەقیوین
٣٣
شەوێکی ئێجگار هێمنە
لە زەلکاوەکەی ئەوبەرەوە
بۆقەکان دەقیرێنن
منیش بۆیان دەسەنمەوە
٣٤
دەفتەرە شیعرەکەمیان
دایە بەر رێژنەی گوللە
شیعرێکی زامدارم هاواری دەکرد و
خۆی دەرنییەوە
بەسەر تەرمی قەسیدەیەکی تردا
٣٥
شاعیرێکی بۆهیمی
دەستی کرد بە گیرفانی پاڵتۆکەیدا
ناو گیرفانەکەی جمەی دەهات لە خەڵک
لەو کاتەدا لەسەر پشت پاڵ کەوتبووم

مشتێکی کرد بەناوماندا
ویستی هەمووومان بفلیقێنێتەوە
هەروای کرد
بە حاڵەحاڵ لە بەینی پەنجەکانییەوە
خۆم رزگار کرد
٣٦
ژیان لەسەر زەوی
یان لە هەر شوێنێکی تاریکی گەردوون
تەنیا خەیاڵێکە
بە کورتی بەناویدا تێدەپەڕین
٣٧
زاناکانی کوانتۆم
گریمانەی ئەوە دەکەن
لە جێگەیەکی تر
کە دەستی خەیاڵمان نایگاتێ
هەر یەکێکمان چەندان کۆپی تری هەبێ
لەو باوەڕەدا نیم
کۆپی من
لە هیچ شوێنێکی کەوندا دەست بکەوێ

٣٨
جارێ وا زوو نامرم
مادام ژنێک هەیە
دەیەوێ بژیم و
بەردەوام شیعر بنووسم
٣٩
دەمەوێ لە بەیتە شیعرەکاندا
ئەبەدییانە دایکوتم
بۆیە کورت دەژیم وەک پەپولە
تەمەن لە دەست کیسەڵ بێزار بووە
٤٠
نیشتمانی من
لەسەر نەخشە نابینرێت
لە رۆحدا
بارگەی خستووە
٤١
هاورێکانم وازیان لێ هێنام
خوشک و براکانم وازیان لێ هێنام
جگەرەکەم وازی لێ هێنام
ئالکهول وازی لێ هێنام
تەنانەت هەموو شت و

هەموو کەس وازیان لێ هێنام
کەچی ژیان لەوە بێ ئابڕووتر بوو
وازم لێ بهێنێ
٤٢
هەمیشە ترس
منێکی سەرکێشی تۆقاندووە
تەنانەت ناهێڵێت خۆشم بکوژم
٤٣
لە خۆشەویستی ژیان نییە
تا ئێستا زیندووم
٤٤
مرۆڤ چەند بەدبەختە
لە نێوان ژیان و مەرگدا
بژاردەی سێهەمی لەبەردەستدا نییە
٤٥
من و ژیان شەڕمان بوو
ویستم خۆم بکوژم
جگە لە من
کەس لەوێ نەبوو ناوبژیمان بکا

٤٦

لەسەری مندا

دوو کەس هاوار دەکەن

یەکێک بە دەنگێکی نەوی

بانگی ژیان دەکات

ئەویتر بە سەدایەکی بەرز

بانگی مەرگ دەکات

٤٧

نامەوێت پیر ببم

مردن تاقمی لە دەمدایە

توانای جوینی گۆشتی جیڕی نییە

٤٨

شاعیر

وردە وردە غەمەکانی خڕ دەکاتەوە

دواتر

لە دیوانێکدا بڵاویان دەکاتەوە

٤٩

تا ناوی "پلاتۆ"مان

راست نەکردەوە

نەمانتوانی لە کۆمارەکەی تێبگەین

٥٠

لە زیندانی ئاسایش
هەتا ئادەم لە بنەچەیان کۆڵیمەوە
بیریان چوو
لە بیرکردنەوەم بپرسنەوە

٥١

دوای مردن
ئارەزووی زیندووبوونەوە ناکەم
حەزم لە شتی دووبارە نییە

٥٢

ئەوەندە باسی خۆکوشتنم کردووە
کاتێک تیرۆرم دەکەن
کەس باوەڕ ناکات
خۆم نەکوشتبێ

٥٣

کاتێک دەگەڕێمەوە بۆ وڵات
بە زوویی دڵسارد دەبمەوە
جانتاکەم دەپێچمەوە و دێمەوە
لەناو فڕۆکەکەدا تێدەگەم
بۆ وێنای پێشووی نیشتمان گریاوم

٥٤

گرفت نییە هەژار بیت
گرنگ ئەوەیە زەنگینانە
بیر بکەیتەوە

٥٥

بیرکردنەوە
لە ژیان قورسترە

٥٦

هۆشمەند کەسێکە
لە بارەی هەموو شتێکەوە نادوێت
لە هەمبەر هەموو شتێکیش
بێدەنگ نییە

٥٧

هەرچی لە دنیادا نوسراوە
بە ئامانجی گەیشتن
بە هەقیقەت نوسراوە
نەک خۆیان هەقیقەت بن

٥٨

زۆرجار پێکەنین
ئاوازێکی رادیکاڵە
لەبەرئەمە بە خواکان
پێدەکەنم

٥٩
ویستم وەک کوردێک بژیم
ڕێگەیان نەدا
گووتیان تۆ هاووڵاتی جیهانیت
ویستم هاووڵاتیبوونی گەردوونی
قبوڵ بکەم
دیسان ڕێیان گرت
پێیان گووتم تۆ کوردیت
٦٠
ساراماگۆ
لە ڕۆمانی "کوێریی"دا
دۆزەخ دادەگرێتە سەر زەوی
چ پێویستی بەو ئەرکە دەکرد
دۆزەخێک لەناو دۆزەخی ڕاستەقینەدا
قوت بکاتەوە؟
٦١
سی ساڵە
کتێب دەخوێنمەوە
بۆ ئەوەی بگەمە ئەو ئارگۆمێنتەی
لە مێژە خودا وازی لە زەوی هێناوە

٦٢
کتێب
دەستمان دەگرێت
بەرەو ناوەوەی خۆمان
تا جیهانی دەرەوە بناسین
٦٣
تێگەیشتن کارێکی قورسە
کێ دەڵێت
ئەم وەرزشە بۆ هەموو کەسە؟
٦٤
ئەوەی لە مردن رادەکات
ئەوەشی باوەشی بە ژیاندا کردووە
هەردووکیان بەرەو مەرگ بەڕێوەن
٦٥
بڕوام بە خۆم نەماوە
هەر بەڵێن بە خۆم دەدەم و
جێبەجێی ناکەم
کە لە سەرەتای شەوێکدا
کۆتایی بە خۆم بێنم

٦٦

لە ڕێی پێغەمبەرەکانەوە

خودا دەناسن

بۆیە دەڵێم نایناسن

٦٧

ئەو مرۆڤەی بیەوێت

لە مرۆڤێکی تردا خۆی بدۆزێتەوە

بۆ ئەبەد خۆی ون دەکات

٦٨

مرۆڤی سەرکەوتوو کەسێکە

بە لوتکەدا هەڵناگەڕێ

بەسەر خۆیدا سەردەکەوێ

٦٩

نازانم

چۆن بێزاریی دایاننناگرێت

لە کاتێکدا گەشبینی

هروژمی بۆ هێناون؟!

٧٠

ئەوەی ژیان

بە شایی سەیر بکات

هەموو کات لە پرسەدا دەبێ

٧١
ئەی مرۆڤ
تۆ خاوەنی زەوی نیت
تۆ لە بنەچەوە
کرمێک بوویت
٧٢
لەوەتی تەکنۆلۆژیا پێشکەوتووە
کەس نەگەیشتووەتە نەمریی
نەمریی کەسێک
پەیوەندیی بە یادەوەریی ئەوانیترەوە هەیە
٧٣
گفتوگۆی بێزەنتینیم
لەگەڵ خۆمدا کرد
تا بڕوام هێنا روو لە تاراوگە بکەم
لەولاوە نیشتمان
بە دوو وشە منی گەڕاندەوە
٧٤
دێوێک لە مندا نوستبوو
درەنگ بە خەبەرم هێنا:
شیعر

٧٥

دنیام لێ بووه به چەرمی چۆلەکە
ماوەیەکە
شیعرگەلێک دەنووسم
سەر ناکەنەوه به ماڵی عەشقدا

٧٦

ناڵێم ئەفسانەم
له مێژووی هەموو جیهاندا
یەک جار هەم
دووباره نابمەوه

٧٧

ئەگەر دۆنادۆن راست بێت
گومان ناکەم
رۆحی دەیناسوور
له جەستەی هەمووماندایه

٧٨

نهێنییه مەزنەکەم دۆزییەوه
ئەوەی تا نهۆ
خۆکوشتنمی دواخستووه
شیعره

٧٩

دلم زۆر پڕ بوو
بە دوای بیانوویەکدا دەگەڕام
بە کوڵ بۆ خۆم بگریم
باش بوو باپیرم مرد

٨٠

لە زیندانی ئاسایش
لەسەر داوای مافی گشتیی
سزایان قورستر کردم
فڕێیاندامە ژوورێکی تاکەکەسی
ئای چەند دەمێک بوو
پێویستم بەوە بوو لەگەڵ خۆم بم

٨١

عەشق و مەشق!
مەشقەکە چییە
جگە لە مەشقی سەرکێشی؟

٨٢

لەناو کۆی ئاژەڵەکاندا
مرۆڤ لە هەموویان بێ عەقڵترە
پارەی داهێناوە

٨٣

هیچ بەهایەک لە ئارادا نییە
ئەگەر مرۆڤ لە ئارادا نەبێ
مرۆڤ جوغزی هەموو بەهاکانە

٨٤

مرۆڤ خوی قلْپ دەکاتەوە
بەو هەموو تەماعەی هەیەتی
بو دەستگرتن بەسەر گەردووندا

٨٥

مرۆڤ ژینگەی خۆی وێران کردووە
لە پێناو بەهەشتێکی قاقڕی گریمانەیی
لەسەر هەسارە و ئەستێرەکانی تر
کە هیچ هەلومەرجێکی ژیانیان تێدا نییە

٨٦

مرۆڤ لەوە گەمژەترە
بە رەخنەلێگرتن
شوخت بکەوێتە لە خۆبایبوونییەوە

٨٧

من لەبەر ئەوە خۆم ناکوژم
دنیا سەرزەنشتم دەکات
دەمەوێ بەو کردەیە
سەرزەنشتی دنیا بکەم

٨٨
چاوەڕێی هیچ لە دنیا ناکەم
تەنیا ئەوە نەبێ
هێندە گێچەڵم پێ نەکات
٨٩
جار جار لەبەر خۆمەوە دەڵێم
ژیان شەربەتێکی خۆشە
گەر ژەهری ئایدۆلۆژیای تێدا نەبێ
٩٠
ژیان هیچی پێ نەبەخشیوم
جگە لە دوو چاوی سەوز
کە بوونەتە مێرگی فرمێسک
٩١
لەو کاتەوە بووم بە شۆڕشگێڕی راستەقینە
وازم لە تێزی شۆڕشی جەماوەریی هێنا و
دەستم کرد بە خەبات لە خودی خۆمدا
٩٢
لە ناو شەمەندەفەرێکی گەنج
بەرەو کیشوەرێکی پیر دەچووم
گوێم لە خۆم گرتبوو
هیچی پێ نەبوو بۆم باس بکا

٩٣
تۆ
شادیی و فرمێسک و دڵ
جوانی و شیعر و خۆمت لێ بردم
ئەی چیت پێ بەخشیم؟:
هیچ
٩٤
مامۆستای مێژوو
بە پەیژەی ساڵەکاندا هەڵدەگەڕا
لە شانزەی سێی ١٩٨٨دا وەستا
بۆنی سێو
لە باخچەی قوتابخانەوە هورژمی هێنا
٩٥
مامۆستای جوگرافیا
خوێندکارێک هەڵدەستێنێ
گەرمیان لەسەر نەخشە دیاری بکا
قوتابییەکە
پەنجە دەخاتە سەر عەرعەر
٩٦
ئەو هەموو خەڵکەی
لە پرسەکەمدا ئامادەن
نیوەیان لە ژیاندا لەگەڵمدا بوونایە
وا زوو نەدەمردم

٩٧

پەڵپ و بیانوو بە ژیان مەگرە
لەبەر خاتری کەس
دەستکاریی سروشتی خۆی ناکا

٩٨

بەدەم ئازاری نەخۆشییەوە
ئەو هەموو ئێستایەم
کردە رابردوو
چی ئێستای تریش هەیە
دەیانکەمە رابردوو

٩٩

لە ژێر شەپۆلی پرچ رەشی شەودا
لە ژێر شەپۆلی قژ زەردی رۆژدا
هەر بەدیار خۆمەوە هەڵتروشکاوم

١٠٠

قەڵافەتی ولیەم یوحەننا[١]
لە قیافەتی گشت سیاسییەکان بەرزتر بوو
ئەو نەیتوانی ئەو نیشتمانە جێبهێڵێ
منداڵانی تێدا فێر دەکرد بڵێن
"خوایە وەتەن ئاوا بکەی"

---

[١] ولیەم یوحەننا ١٩٢٤-٢٠٠٥ هونەرمەندی موزیکژەنی سلیمانی و کوردستان، ئاوازدانەری سروودی "خوایە وەتەن ئاوا بکەی". لەسەر گۆڕەکەی کە شیوەی مۆنۆمینتی هەیە نوسراوە "وەتەنی من کوردستانە".

١٠١
شارستانێتی ماتریاڵیی
باوەڕ بەوە ناکات
مرۆڤ رۆحی تیا بێت
١٠٢
وەک ئەوەی رۆژانە نەڕوخێین
لە ترسی رووخان
خۆمان لە خۆشەویستی دەدزینەوە
١٠٣
مرۆڤ
هەرچەند هەوڵ و تێکۆشانی کرد
سەرکەوتوو نەبوو
لە داڕنینی پێستی ئاژەڵانەی خۆی
١٠٤
مرۆڤ هەزارەها دیمەنە
رواڵەت تەنها دیمەنێکە
ئەوانیتر نابینرێن
رەنگە لە شوێنێکی تاریک هەڵگیرابن

کۆتایی ئاپریلی ٢٠٢١ تا سەرەتای یونی ٢٠٢١ "نزیکەی لە پەنجا رۆژدا نووسراون"

١

ژیان
شوشەیەک ژەهرە
دەبێت هەر لە سەرەتاوە
بینی پێوە بنێی

٢

زانست زۆر سەرقاڵە
بەردەوام کونە رەشەکانی گەردوون
دەدۆزێتەوە
ناپەرژێتە سەر ئەوەی
شەبەقێک لە شعوری مرۆڤدا
ئاشکرا بکا

٣

پێش مودێرنێتە
مرۆڤ پەپولە نەبووە
ئەوەتەی مرۆڤ هەیە
بۆ یەک رۆژیش
کەوڵی گورگی فڕێ نەداوە

٤

با قسەیەکیش بۆ دز بکەین
مرۆڤ پێش باڵادەستی تەکنۆلۆژیاش
نەیزانیوە خۆشەویستی چییە

٥

باوەڕم بەو پۆلێنە نییە
فەیلەسوف و بیریاران
لە ژێر ناوی مودێرنە و پاش مودێرنە
پێش زاین و دوای زاین دەیکەن
ژیانی مرۆڤایەتی یەک قۆناغ زیاتر نییە:
دڕندایەتی

٦

رۆژێک دێت
ئەم زانستەی گەڕانەوە ناناسێ
بە جۆرێک مرۆڤ دەباتەوە دواوە
دەبێت لە چاخی بەردینی کەوناراوە
دەست پێبکاتەوە

٧

ناچارم ناچار
لەگەڵ غروبێکدا بڕۆم
ئەوەش پێش تۆ
خۆم پەست دەکا

٨
من نامرم
رۆحێکی قەقنەسیم هەیە
لەناو خۆڵەمێشی خۆمەوە
دووبارە سەر دەردەهێنمەوە
٩
لەبەرئەوە رۆمانەکەم تەواو ناکەم
وەک منداڵێکی شووم
سەرم دەخوات
١٠
زۆربەی راسیستەکان
گوێ لە موزیکی بیتهۆڤن دەگرن،
زۆریشیان خوێنەری شیعری
ریلکە و هێرمان هێسەن[١]
١١
هێندە عاشقی وشەم
دوای شیمۆ تێراپی
وشە هەڵهێنمەوە

---

[١] ئەمبیرتۆ ئیکۆ باس لەوە دەکات بەرپرسانی کەمپی ئاوشویتز کە جولەکەکانی تیدا لەناو دەبرا، گوییان لە موزیکی یوهان برامس دەگرت و خوینەری "گۆتە" بوون.

١٢

پیتەر هانکی[١]

لەبەردەم رۆژنامەنووسدا وتی

ریشەم دەچێتەوە سەر

هۆمیرۆس و تۆلستۆی و سێرڤانتس

راستتر وابوو بڵێ

من لە بنەچەی "دیتریش ئیکهارت"م[٢]

١٣

مرۆڤی مودێرن

لە هیچی کەم نییە

جگە لە برێک خۆشەویستی

١٤

شیعری من رەنگێکی تازەیە

گروپی رەنگە باوەکان

لە ناو خۆیاندا جێی ناکەنەوە

---

[١] پیتەر هانکی 1943، نووسەری نەمساویی و وەرگری خەڵاتی نۆبلی ئەدەبیات لە ساڵی 2019. بە دۆستی نزیکی "سلۆبۆدان میلۆسۆڤیچ"ی دیکتاتۆری پیشووی یوگسلاڤیا دادەنرا.

[٢] دیتریش ئیکهارت 1868-1923 شاعیر و شانۆنامەنووس و رۆژنامەوانی ئەڵمانی و دامەزرینەری "پارتی کاری ئەڵمانی DAP" کە دواتر لە دامینی ئەو پارتەوە نازییەکان کەوتنەوە.

١٥

بێهننە بەرچاو

پۆلیسی مەریخ دەیەوێت

کۆمەڵێک کوردی قاچاغ

بۆ سەر زەوی سنورداش بکاتەوە!

١٦

رۆبۆتێک و مرۆڤێک

دەبێتە شەڕیان

دادگا لایەنگریی رۆبۆتەکە دەکات

گوایە هەستی بریندار بووە

١٧

لە فڕۆکەخانەی بەهەشت

کوردێک لە تەوالێتدا خۆی شاردووەتەوە

پۆلیس بەسەریدا دەدا

بە پاسپۆرتی ساختەوە هاتووەتە ژووری

١٨

بەختەوەریی

لە کلێتەیەک دەچێت

بەسەری مرۆڤی نوێوە ناچێ

١٩

حەزناکەم بمرم

لە ترسی زۆر بڵێیی ئەو مردووانەی

پەنجا ساڵە مردوون و

عەودالی هەواڵێکی دەرەوەن

٢٠

شیعری من نەک رێزمان

بەڵکو لۆژیکیش تێکدەشکێنێ

سەهۆڵی گڕدار و

ئاگری بەستووە

٢١

نوسیبووم دەیان هەزار ساڵە

خەونی دووبارە دەبینم

وتی ئەمە دژی لۆژیکە؟

وەک ئەوەی باپیرە نیاندەرتاڵەکانمان

خەونیان نەبووبێ

٢٢

شیعری کوردیی

دەنگ گڕێکی دیوەخانە

شیعری من

مێینەیە. مێینە

٢٣
بتڵە غازێکم بینی
لە هۆڵی دادگاییکردن
تۆمەتی کوشتنی هەزاران ژنی
درابووە پاڵ!!
٢٤
داپیرەم لە سەرەمەرگدا بوو
زەردەخەنەیەک بە لێوەکانییەوە
وشک نەدەبووەوە
نەمزانی
بۆ ژیان بوو یان مەرگ؟
٢٥
هەر کات
باسی میهرەبانیی ژنێک دەکرێت
بەهۆی داپیرەی خۆمەوە
داپیرەکانی هەموو دنیا
دێنە بەرچاوم
٢٦
دایکم ژنێکی سەربەخۆ بوو
سەر بە خۆی بوو
بۆیە سەری پێوە نەما

٢٧

ئەوانەی تووشی ئەلزەهایمەر دەبن

خۆراکی یادەوەرییان لێ دەبڕێ

زۆر نابات دەمرن

٢٨

دایکم زۆر جیاواز بوو

هەموو کەس دەیانگووت

باوکم لە مێژە تیرۆر کراوە

ئەو کە ژنێکی تەڵاقدراو بوو

دەیگووت هێشتا زیندووە

٢٩

سەدەی خێراییە

هەر وەک ئەوەی بەدەم راکردنەوە

سەندەویچ بخۆین

ئاوهاش ژیان تام دەکەین

٣٠

گریانم دەژەنی

ئەو پێدەکەنی

پێکەنینم دەژەنی

ئەو دەگریا

٣١

بەوەدا بزانە

عاشقت نەبوو

تۆ رۆیشتیت، ئەم نەگریا

٣٢

دەشێ ژیان

ئەو گۆرانییە شادەش بێ

بە هەموومان دەیڵێین

٣٣

بۆ تێگەیشتن

لە ئاستی درندەیی مرۆڤ

لە چاوی ئاژەڵێکەوە بڕوانە

٣٤

چونکە هەموو بوونم

تراژیدیایەک بوو

دەمویست کۆمیدیایە

بینووسمەوە

٣٥

پرسیار مەکە

لە بارەی مێژووی لە دایکبوونمەوە

من هێشتا لە دایک نەبووم

٣٦

زەمەنی من هێشتا نەهاتووە
رەنگە هەر نەیەت و
لە سکی دایکمدا لەبار بچم

٣٧

کاتێک بەدوای وشەدا دەگەڕێم
وەک ئەو ماسیگرەم
تۆڕی هەڵداوەتە دەریاوە

٣٨

لەناو ئاپۆرادا
رێی خۆم دۆزییەوە
لەناو دەستەبژێردا
ون بووم

٣٩

چەتەیەکی منداڵکار
گەنجینەی خەیاڵی تالآن کردم
ئەویش چەتەیەکی ریش چەرموی
لێ پەیدا بوو

٤٠

ئەوانەی خەونی درۆ هەڵدەبەستن
سەرلەبەریان قێزەونن
جگە لە جەمیل سائیب[١]

---

[١] ئاماژەیە بۆ چیرۆکی "لە خەوما"ی جەمیل سائیب 1951-1887. کە لە ساڵی 1925 بۆ رەخنەگرتن لە حکومدارییەکەی شێخ مەحمودی حەفید نوسیبووی.

٤١
پێویستم به رەخنەیه
تا دەتوانن رەخنەم لێ بگرن
خەریکه به چەپڵە دەمرۆخێنن
٤٢
که مردم
تەنیا له رێی ئەو یادەوەرییانەوه
بانگم بکەرەوه بۆ لای خۆت
ماچمان دەگۆڕییەوه
٤٣
ئەرکەکەم
له کاری ئەوانیتر قورستره
ئەوان دەرگاکان دادەخەن
من یەک یەک دەیانکەمەوه
٤٤
هەر مرۆڤێک
سندووقێکی رەشی خۆی هەیه
فەلسەفه دەیەوێت
دەستی بەو سندووقه بگات

٤٥
دڵی موسڵمان و ناموسڵمانم ئێشاند
بەوەی گووتم
قورئانم قبوڵە
وەک هەر کتێبێک لە کتێبەکانی تر
٤٦
مالارمێ و ئەندرێ ژیدم
لە یەک رۆژدا ناسی
بەڵام مالارمێ زوو زوو
لە دەرگای دڵم دەدا
٤٧
ژمارەی مرۆڤ کەم بووەتەوە
بۆچی ئێوە
ئەو زیندەوەرە غەریزییانە
بە مرۆڤ سەرژمێر دەکەن؟
٤٨
مەحوی
یەکەم کوردە
دژی فەلسەفەی ئایۆنی وەستایەوە[١]

---

[١] مەحوی دەڵێت "بەئاوی تیگەیشتین ئیمە دنیا هەر سەرابی بوو..". یەکەمین قوتابخانەی فەلسەفیش "ئایۆنی" ئاو بەسەرچاوەی هەموو شت دەزانیت.

٤٩
راستە عاشقبوون ژانێکە
بیر بکەنەوە
ئایا پێش عاشقبوون
بێ ئازار بوون؟
٥٠
گیرم خواردووە
بە دەست عەقڵمەوە
لە پێش خۆمەوە
هەنگاو دەنێ
٥١
کێشەم لەگەڵ ئەوانە نییە
هۆکارێکیان هەیە
بۆ رق لێبوونەوەم
کێشەم لەگەڵ ئەوانەیە
بێ هۆکار دەمبوغزێنن
٥٢
چ کتێبێک هەیە
باسی نیشانەکانی شێتی بکا؟
هەوڵدەدەم بزانم
چەند نیشانەم تێدایە

٥٣
ئەوی شیعر سادە بکاتەوە
هەر کەس بێ
"ئاو لە سەرچاوەوە لێڵ" دەکات
٥٤
بێ ئومێدیی دەپژمێت
من دەردەپەڕم
غەمگینی زامدار ئەبێ
من فیچقە دەکەم
٥٥
هیچ خەونێک نییە
دوور و نزیک بە واقیعەوە
گرێ نەدرابێ
نازانم لەبەرچی ناوبانگی
خەون بەو جۆرە زڕاوە؟
٥٦
ئەوەی راستی بێت
خۆم بۆ سەردەمێک هەڵنەگرتووە
مرۆڤ، ژیان بڕازێنێتەوە

٥٧
تەکنۆلۆژیا
سێوێکە لایەکی گەنیوە
هەمیشەش
ئەو لایەی دەشارێتەوە
٥٨
یەک پێناسەمان بۆ ماوەتەوە:
مردووی زیندوو
زیندووی مردوو
٥٩
من توانج لە ژیان نادەم
بەڵکو رەخنە لە دنیا دەگرم
٦٠
ژیان دوو دیمەنە:
منداڵێکی تازە لە دایکبوو
لەناو ئۆتۆمبیلێکدایە بۆ ماڵەوە
جەنازەیەکیش لە پشتی پیکابێکدایە
بەرەو گۆڕستان

٦١

هەرچی ژان و ژواری مرۆڤە

لە نێو ماڵی ژیاندایە

لەوە بەولاوە

هیچ ئازارێک بوونی نییە

٦٢

دوای سەد و شەش ساڵ

بەسەر مردنی "تۆلستۆی"دا،

لە رووسیادا

هەمان شتم دەبینی

لە رۆمانی "ئانا کارنینا"[١]دا

خوێندبوومەوە

٦٣

رۆشنبیرانی ئێمە

لە نێو ئەشکەوتە فیکرییەکانی خۆیاندا

خەریکی دەستپەڕن

٦٤

لەبەرئەوە هێشتا چەپم

ناوچەی بیرکردنەوە

دەکەوێتە بەشی چەپی مێشک

---

[١] رۆمانی "ئانا کارنینا" یەکیکە لە رۆمانە هەر ناودارەکانی لیۆ تۆلستۆی. کە ساڵی 1877 لە چاپ دراوە.

٦٥
مردووەکان تەلقین مەکەن
بیری زیندووەکانی بخەنەوە
وەک مردوو نەژین
٦٦
ئەوانەی رقیان لێمە
هیچ ئەرزشێکیان بۆ دانانێم
بە هەموویان
دە کتێبیان نەخوێندووەتەوە
٦٧
سلێمانی بۆ من
شارێکە پڕە لە مەتەڵ
هەر جارەی مانای یەکێکیان
هەڵدەهێنم
٦٨
لە گەنجیدا خەونم دەبینی
ببمە سپارتاکۆس[١]
ئەمێستا بەشی ئەوەش
خەونم نەماوە
ببم بە خۆم

[١] سپارتاکۆس 71-111ی پیش زاین ژیاوە، رابەری شۆڕشی کۆیلەکانی رۆمای دیرین بوو، کە بۆ مارکس ئایکۆن و نموونەی بالا بوو.

٦٩
بیری ئەو رۆژانە دەکەم
منێکی کورد
لەگەڵ "فرانسیس داود"[١]ی ئەرمەنی
بە زمانی مۆسیقا
قسەمان دەکرد
دڵنیا نیم
٧٠
بە سووتاندنی کتێبەکانم
ناوبانگی خۆمم پێ دەسڕێتەوە
ئەگەرنا هیچ دوودڵ نەدەبووم
٧١
بورجەکەم شێرە
تا ئێستا جگە لە ناسۆر
هیچ نێچیرێکی ترم نەخواردووە
٧٢
رایەکی پێچەوانەم هەیە
بەرگریی لە کۆمەڵگا ناکەم
داکۆکی لە مافی تاکێتی خۆم دەکەم

---
[١] مامۆستا فرانسیس داود بەرەکەت بکەوێتە تەمەنی، مامۆستای موزیک و ئەندامی تیپی مۆسیقای سلێمانی.

٧٣
هایدگەر وتی
"زانست بیر ناکاتەوە"
ئای لەو قوڕە خەستەی مرۆڤی تێکەوتووە
شتێکی بیرنەکەرەوە
لە بری ئێمە بیر دەکاتەوە
٧٤
تاراوگە
ئەگەر بۆ هەر پەناهەندەیەک
یەک جار ئازار بێت
بۆ من دووجار ئێشە
٧٥
هەژارەکە
سەیری تەلەفزیۆنی دەکرد
زانایەکی ناسا
باسی بێ سنووریی گەردوونی دەکرد
هەستا پەرداخێک ئاو بهێنێ
تەلەفزیۆنەکە لەبەر تەنگیی ژوورەکە
بەربووە و شکا

٧٦

هەرگیز مەوەستە

تەنانەت رووبارەکانیش

بە وەستان بۆگەن دەبن

٧٧

سەرمایەداریی

وەک مەشکە دەمانژەنێت

"رۆن کەرە"ی گیانمانی دەوێت

٧٨

لەو کاتەوەی مرۆڤ

چووەتە جێگەی خودا[١]

هێندەی تر

دنیا خوار و خێچ بووە

٧٩

هەر سەیری پێشەوە بکە

بەڵکو رۆژێکی جیاواز هەبێ

نەکەیت ئاوڕ بدەیتەوە

بە بۆنی تەرم دەکەویت

---

[١] نیتچە بانگەوازی مردنی خوای کرد کە ئیدی مرۆڤ ممارەسەی هەموو دەسەڵاتەکانی خوا دەکات.

٨٠
ئێمە موسافیر نین لەسەر زەوی
ئێمە بەڕێوە نین بۆ هیچ کوێ
ئێمە یەک جار هەین و
بۆ ئەبەد ون دەبین
٨١
مرۆڤ
ئامرازی پەیوەندیی نییە
لە نێوان زەوی و ئاسماندا
٨٢
سەر زەوی
ماڵی رەسەنی مرۆڤە
هەر کات هەواری گواستەوە
بۆ هەسارەیەکی تر
لە مرۆڤ دەچێتە دەرەوە
٨٣
بە پووچبوونەوەی چیرۆکە ئاینییەکان
راستییەک خۆی دەرخست:
مرۆڤ بوونەوەرێکی تەنهایە

٨٤

لە هەر قۆناغێکدا

دنیا ڕووخسارێکی هەیە

تێگەیشتن لە دنیا

تەنیا تێگەیشتنە لەو ڕووخسارە

٨٥

کۆمیدیترین کەسەکان ئەوانەن

پێناسەی ژیان دەکەن

٨٦

زانست بێلایەن نییە

دەستی لەو هەویرەدایە

مرۆڤایەتی سەرگەردان کردووە

٨٧

بەردەوام

ئەوەندەی لە عەشقەوە نزیکم

لە مەعشوق نزیک نەبووم

٨٨

ئێمە دەمانەوێت لە خۆشەویستیدا

تەنها بەر لەحزە ڕۆمانسییەکان بکەوین

نەک بەر هەقیقەتەکان

٨٩

لە دوای یەک مانگ
دەستی لە خۆشەویستیم هەڵگرت
گوایە بە کەڵکی عەشق نایەم
ناهەقی ناگرم
ئەو تەنیا رووکەشی بینی
هەرگیز دەستی نەگەیشت بە ناوەوەم

٩٠

ئەو وێنایەی نیگای یەکەم
لە مێشکی مندا کاڵ کاڵ بووەتەوە
کەچی خۆشەویستییەکەی
تۆخ و تۆختر بووە

٩١

سەر بە دنیایەکی ترم
سەرەتا
شێتی دنیای عاشقان بووم
ئەمێستا
عاشقی جیهانی شێتەکان

٩٢
توانام هەیە
کتێبێک لە دێڕێکدا کورت بکەمەوە
یان لە شەرحی دێڕێکدا
کتێبێک بنووسم
٩٣
بەراشکاویی دەڵێم
شیعری تازەی رۆژئاوایی ناخوێنمەوە،
تاک و تەرا نەبێت
ساردوسڕیی کوشتوونی
٩٤
بۆ من جێگەی پرسیارە
مرۆڤ بە چ روویەکەوە
خەریکی نووسینەوەی مێژووی خۆیەتی!؟
٩٥
لێیان پرسیم تۆ کێی؟
وتم من خۆمم
گووتیان بۆچی کەس هەیە خۆی نەبێ؟
وتم بە ملیاران

٩٦
تەنیا متمانە بەو کەسە بکە
هەمیشە دەڵێت:
نەخێر
٩٧
هێشتا لە بارەی
کێشەکانی مرۆڤەوە دەنووسن
لە کاتێکدا شتێک نەماوە
بە ناوی مرۆڤەوە
٩٨
ئەگەر بمانەوێ
دنیا رێک بخەینەوە
پێویستە دوو جەنگی جیهانی تر
بەرپا بکەین
٩٩
هەموومان لە گۆڕەپانی سێدارەداین
یەک یەک ناومان دەخوێنرێتەوە
نۆرە دێتە سەر من
دەلەرزم
هێشتا بۆنی شیری خاو
لە دەمم دێت

١٠٠

یەک جار دەبوو پێبکەنم

بوو بە ژێر پرسەی دایکمەوە

یەک جار پێویستم بە گریان بوو

کەوتە ناو ئاهەنگی هاوسەرگیرییمەوە

١٠١

هەردوو دەستم

لە گیرفانی قاپووتەکەمدایە

چنگێک پێکەنین دەردەهێنم

بە شەرتی گریان

١٠٢

ماڵەکەم هەرزان فرۆش کرد

کوپێکی قاوەی زەخرەفەداری کۆنم هەبوو

دە ئیرۆی بۆ کردم

بێتی خەوەکەم بە چل فرۆشت

تێکڕای کەلوپەلەکانم

بایی سەد و هەشتا و دوو بوو

هەقی گواستنەوەی کتێبەکانم

سەد و هەشتا وسێ ئیرۆی تێچوو

١٠٣
ژەنەراڵی پایز[1]
پرۆژەیەکی خۆکوژیی بوو
تەوقیتەکەی کەمێ دواکەوت
١٠٤
لە هیچ شتێکدا
ئاژەڵمان تێنەپەڕاندووە
جگە لە دڕندەیی
١٠٥
جیاوازیی مرۆڤ لەگەڵ ئاژەڵ لەوەدایە
هەموو ئاژەڵێک دڕندە نییە
بەستەزمانترین مرۆڤ
لە پڵینگ دڕندەترە
١٠٦
ئاینەکان[2]
ڕەوشتی مرۆڤیان تێکدا
مەهێڵن شیعر
جێگەی ئاین بگرێتەوە

**کۆتایی ئۆگەستی ٢٠٢٠ تاکو سەرەتای یونی ٢٠٢١.**

---

[1] محەمەد عومەر عوسمان "ژەنەراڵی پایز" دوای "ئەحمەد نالبەند" یەکەمین شاعیری کوردە پرۆژەکەی خۆی بە خۆکوژیی تەواو کرد.
[2] سلاڤۆی ژیژەک وتی: بۆ خراپکردنی خەڵک پێویستمان بە دینە، ڕەنگە شیعریش بتوانێت هەمان کار بکات.

١

هەر مرۆڤێک
بۆ خۆی گەردوونێکە
پڕ پڕ لە نهێنی و تاریکی

٢

لەناو تەرمی سەربازە کوژراوەکاندا
بۆ سەری خۆم دەگەڕێم
دەمەوێ کۆتا خەون ببینم

٣

داهاتوو تاریکییە
بەهۆی ئەوەی مردن
لەسەر ڕێی ئایندە وەستاوە

٤

ئەم پرسیارە
بیرکردنەوەی خواردووم
حیکمەتی هاتنە دەرەوەم چی بوو
لە ئۆقیانووسی بێ بنی عەدەم؟!

٥

ئەوەتەی هەم
ژیان لێم درِدۆنگە
هێندەش بەدبەختم
شانسی مردنم نییە

٦

ژیان
گرتەیەکی سینەماییە
تەنیا یەک گرتە
ئەگەر دوو گرتە بوایە
زۆر شت دەگۆڕا؟

٧

ژیان تاکە پیرەژنە
هەموو لە ئامێزی دەگرن
حەزم لە بۆنی بن باخەڵی نییە

٨

گوێم لێ بوو
خوا خۆی دەیگووت
دۆزەخ کەسی تر ناگرێ
مەلاکانیش بەردەوام
خەڵکیان بۆ ئەوێ دەنارد

٩
چەرمەسەریی
پاژنەی ئەخیلی زۆربەمانی دۆزیوەتەوە
دەزانێت لە کوێوە بێت!
١٠
بۆم جیا ناکرێتەوە
من ئاخنراوم لە وەهم
یان
وەهم پڕ بووە لە من؟
١١
پشیلەی تەکنۆلۆژیام بینی
دوای خواردنی
کوکوختی شیعر
ددانی پاک دەکردەوە
١٢
ئەوروپا چاوبەست بوو
گیرفانی خەونەکانی
تەژی کردین لە پەشیمانی

١٣
مێژوو
کتێبێکی قەبەیە
کوێرێکی نەخوێندەوار
دەیخوێنێتەوە
١٤
کە لە سوێد گەڕامەوە
هەموو شتێکم
بە زمانی هەنسک و رۆندک
بۆ دایکم گێڕایەوە
١٥
مرۆڤ
چاویلکەکەی ون کردووە و
چاوشارکێ لەگەڵ خۆی دەکات
هەرگیز خۆی پێ نادۆزرێتەوە
١٦
کە چووینە سەر دەریا
بە هاوڕێکانم گووت
تا ئەو نوستووە
بەلەمەکە بئاژۆن
ئەمەم لە دەفتەری رۆژانەی
قاچاغچییەکی سنووردا خوێندەوە

١٧
شارستانی تازە
ژیاری ون بوونە
هیچ شتێک دیار نییە
جگە لە بورجی کارەسات
١٨
تەکنۆلۆژیا جادوویەکە
ئەفسونە کلاسیکییەکانی بەزاند
١٩
بە دڵڕەقی و بێ گوێیەکانمان
سەری دایکە دونیامان
سپی سپی کرد
٢٠
مرۆڤی هاوچەرخ
زەق زەق سەیری ئەوانە دەکات
خۆیان بە تاڵە باریکەکانی ئومێدەوە هەڵواسیوە
چۆن بەردەبنەوە هێلانەی بێهیوایی
هێشتا خۆی بۆ ئەوە دەکوتێ
دەستی بگاتە تاڵێک

٢١
ژیان
وشەیەکە لە فەرهەنگی کوێرەوەریی
٢٢
جیهانی نوێ
رستەیەکی لێڵە
لە کتێبی گومان
٢٣
تەرمەکەم پێدەکەنێ
لەوانەیە بیەوێت
پیرۆزبایی رزگاربوونم لێبکا
٢٤
ئێمە ئەو کەم بینایانە بووین
نیولیبرالیزم
بە چاویلکەی رەش
خەلاتی کردین
٢٥
هێندەی دەبێت
ترسمان لە ژیان هەبێت
نابێ لە مەرگ بتۆقین

٢٦

مەرگ یەک جار ئەزموون دەکرێ
ژیان رۆژانە
چەندان جۆری مردنمان
پێ ئەزموون دەکا

٢٧

سەیری دەوروپشتم دەکەم
لەبەرچاوی حەشامات
بە چڕوچاوی ژیاندا دەڕشێمەوە

٢٨

لە هەموو رستەیەکما
ژیان دەیەوێ جێی خۆی بکاتەوە
چەند مازۆخییە
حەزی بە جنێوەکانمە

٢٩

کات قاچی نییە بڕوات
ئەوە خۆمانین
بەناو کاتدا بەرەو عەدەم
رێ دەبڕین

٣٠
لە چل ساڵ ڕەت بووم
تا ئێستاش چەشنی منداڵی
دەستم لە قژی خەیاڵدایە
٣١
داپیرەم دەیووت
پێکەنینمان پێوە نایە
ئەمە زادەی ئەو عەیامە بوو
خەڵک دەیانزانی پێبکەنن
٣٢
زۆر سەختە
بەرسڤی پرسیارەکانی
تافی گەنجیمان
لە پیریدا وەردەگرینەوە
٣٣
ژنێک لە خەونەکانمەوە
هاتە دەرێ
تا مردن بە دوایدا ڕامکرد
نەیگەشتمێ

٣٤
"فەلسەفە نەخۆشە"[1]
لە ئاکوتی نەخۆشخانەیەک
زانست دەرزی ژەهری لێدەدا
٣٥
ژیان کتێبێکە
کتێبێکی رزیوی کۆن
هیچی تێدا نەنوسراوە
پەڕە سپییەکانی دەخوێنینەوە
٣٦
ئێمە بە چەندان شێوە
ژیان تاقی دەکەینەوە
کەچی هەمووومان
بە یەک شێوە دەمرین
٣٧
رابردوو
سندووقێکی خاڵییە
هیچی تێدا نییە
تەنانەت شتێکیش
بە کەڵکی ئێستا نەیەت

[1] ئالان بادیۆ لە چاوپێکەوتنێکی خۆیدا وتی "فەلسەفە نەخۆشە"، منیش پێموایە زانست دەیکوژێت.

٣٨

رووتیان کردمەوە
بە مەزەندەی خۆیان
هەموو شتیان لێسەندم
بە خەیاڵەکانم
هاتمەوە مایە

٣٩

وەک پاشەڕۆکێک فڕێیاندام
وەک ئەوەی خراپترین پیاو بم
لە زەمەنی پیاوچاکەکاندا

٤٠

دابڕان
دوا لاپەڕەی هەموو کتێبێکی
خۆشەویستییە

٤١

مرۆڤ چەند گێلە
بە دوای مانەوەی خۆیەتی
لەسەر هەسارەیەکی تر
ئای لەو ڕۆژەی
گەردوون باوەش دەکاتەوە بە خۆیدا!

٤٢
بیرکردنەوەم
وەک ئەختەبووت پەل دەهاوێ
ئەمرۆش گەیشتبووە کەناری
خۆکوشتن
٤٣
زۆر بە دوای ئاسودەییدا گەڕام
لە هیچ شوێنێک نەمدۆزییەوە
تەنێ لە فەرهەنگە زمانەوانییەکاندا نەبێ
٤٤
شادومانی
هەڵەیەکی زمانەوانییە
رۆژانەش دووبارەی دەکەینەوە
٤٥
مرۆڤ
بۆ تێگەیشتن لە خۆی و جیهان
سەرەتا پەنای بۆ ئەفسانە و ئاین برد
دواتر بۆ فەلسەفە
کۆتا جار بۆ زانست
ئەویش خۆی و جیهانی قلّپ کردەوە

٤٦
زاناکان
راستتر بڵێم
ئەوانەی سەرقاڵن بە زانستی رووتەوە
هەمیشە نیوەیان تاریکە
٤٧
زۆرجار
لەبەر خۆشەویستی کتێب
بۆ خاتری ئیشتهای زۆرینە
دەڵێم خۆزگە
کتێب پارچەیەک کێک دەبوو
٤٨
بە مردنم
زۆرن ئەوانەی دڵتەنگ دەبن
لە پێش هەموویانەوە
راپۆرتنووسەکان
٤٩
تۆش ئەی خوێنەر
کە ئەم دێڕانە دەخوێنیتەوە
لەوە تێبگە
هیچم نەگوتووە لە دەرەوەی ژیان

٥٠
کتێب
قاچاغچی سنوور نییە
بتپەڕێنێتەوە بۆ کیشوەری دڵنیایی
لە کێڵگەی گوماندا جێتدەهێڵێ
٥١
بە خوێندنەوەی کتێبە مێژووییەکان
یا باوێشکم دێت
یان مووەکانم گرژ دەبن
٥٢
مرۆڤ هەیە
نیشتەجێی چالاییەکانە
ئارەزووی نییە
بە قادرمەکانی ژیاندا سەربکەوێ
گەر سەد کەڕەتیش لافاو بیبا
٥٣
ژیان دەبوو خەوتنی تێدا نەبێ
هەزاران ساڵ پێش لە دایکبوون
نوستبووین
لە مردنیشدا بێ بڕانەوە دەنووین

٥٤
گەشبینی زیندانێکە
جمەی دێت
لەو مرۆڤانەی سەریان
یەک تاکە خەونی تێدا نییە
٥٥
کە باسی مرۆڤی ناسک دەکەن
پێکەنین دەمگرێ
ئەوەتی مرۆڤ هەیە
دەنوک دەهاوێ
٥٦
ئاسوودەیی
بەرگی سەرابی لەبەردایە
بۆ ئەوەی ئاسوودە بیت
بە دوایدا رامەکە
٥٧
دنیای دەرەوە
جیهانی کێشەکانە
هەر مرۆڤێک
ئاریشەکانی فڕێ دەداتە
دەرەوەی خۆی

٥٨
نیشتمان
گۆرانییەکی فۆلکلۆریی بوو
لە رادیۆوە گوێمان لێ دەگرت
٥٩
شیعرەکانم
زۆر ماندوون بە دەستمەوە
بیر لە خۆپیشاندان دەکەنەوە لە دژم
٦٠
کۆتا دەستکەوتی مرۆڤ لە ژیاندا
بریتییە لە مردن
٦١
چاو نابڕمە ئاییندە
لە دیارییەکانی دەترسم:
گۆچان و حەبی شەکرە
٦٢
چ کۆمیدیایەکە
بە گروپ گۆرانی
بۆ تەنهایی دەڵێن!؟

٦٣
هاشا دەکەم
خەونێکی گەشبینانەم دیبێ
ئەگەر پێتان خۆشە
لە دادگا بۆتان دەسەلمێنم
٦٤
ئەو شاعیرە هیوابەخشە من نیم
شیعری من
یەک مسقاڵ ئومێدی تێدا نییە
٦٥
لە باشترین باردا
مرۆڤبوون گوڵێکە
هێشتا لە باخی گەردووندا نەڕواوە
٦٦
خۆشبەختی وەک خەیاڵ
شتێکی خزە
بە دەست ناگیرێ
٦٧
تەرمێکم
تا ئێستاش بزەی نیشتمان
لەسەر لێوم وشک نەبووەتەوە

٦٨

لە چەندین لاوە شەڕ دەكەم
قورسترین شەڕیشم
لەگەڵ جیناتی خۆمە

٦٩

ئەمڕۆ
دە كۆمەڵە شیعرم لە بێژنگ دا
یەک شیعری لێ مایەوە

٧٠

رەشبینی
سوپایەكە لە كرۆمۆسۆمی مندا
هەموو شەوێک
سەنگەری گەشبینی تێكدەشكێنێ

٧١

لە نێوان من و ژیاندا
چیرۆكێكی مردارەوەبوو هەیە

٧٢

شتێک لە مێشكمدا رواوە
گوومانم نییە
دڕكێكی تری مەراقە

٧٣
چل ساڵە
بەرم بەو ڕەشەبایە گرتووە
لە ناوەوەی مندا گڤەی دێت
٧٤
ئەو تیرەی من
لە بری دڵی یار
جەرگی کۆمەڵگەی بڕی
٧٤
شەوێک لە گۆڕستان خەوتم
تا ئێستاش هەر دەیڵێمەوە
ئەی بۆ باسی ئەوە ناکەم
چۆن دەتوانم ئەو هەموو شەوە
لەناو زیندووواندا بخەوم؟!
٧٥
هەموو تەمەنم
لەسەر ڕووباری بیرەوەریی بەڕێ کرد
بۆ یەک جاریش
یادگارییەکی شیرین
نەبوو بە قولابەکەمەوە

٧٦
"ژیانی خۆمت پێدەبەخشم"
ئەمە ناونیشانی
جوانترین درۆی رۆمانسییە
٧٧
نەنگییەکی ئاشکرام هەبوو
هیچ کەس نەیبینی
ناچار شاردمەوە
٧٨
شۆڕشی ئۆکتۆبەر
جۆرێکی تر بوو
لە بەدەسەڵات گەیشتنی ئاین
٧٩
سەرسامم
بە رەشبینی بۆدلێر
ئەویش سەرسام بوو
بە نائومێدییەکانی ئیدگار ئالان پۆ
٨٠
ئەو رۆژەی دەمرم
زەماوەند بگێڕن
لەوانەیە رۆژی لە دایکبوونم بێ

٨١

شمشێری رۆژگار

کوناودەری کردووم

بەڵام ئەوەی من بە تەنیا کردوومە

ئێوە بە کۆگەلیش پێتان ناکرێ

٨٢

ژیان لە دەمی مندا

تامی مردن دەدا

٨٣

دەسەڵاتم هەیە بەسەر خۆمدا

هەموو شتێک تەرک بکەم

جگە لە خۆشەویستی

٨٤

بەقەدەر رقم لە ناسیۆنالیزم

نیشتمانی خۆمم

خۆشدەوێت

٨٥

هەرچی ئیمپراتۆرییەتەکانە

بە کەوڵکردنی مرۆڤ

دەستیان پێکردووە

نهێنی ئەوەی کورد

خاوەنی ئیمپراتۆریا نەبووە لێرەدایە

٨٦
دۆستۆیڤسکی
ماڵباتی خۆی فەرامۆش کردبوو
بە خاتری خانەوادەی کارامازۆڤ
٨٧
بێماناترین هەوڵ
گەڕانە بە دوای مانای ژیاندا
٨٨
مێژووی پێکەنینم دەنووسییەوە
لە ناکاو کەوتمە گریان
٨٩
ئەگەر بە لۆژیکی زۆرینە
هەڵمدەسەنگێنن
شتێکی وەهام لێ نامێنێتەوە
شیاوی باس بێت
٩٠
هیچ غەمێک
ناتوانێ بمگریەنێ
تەنیا لە ئامێزی مەعشوقدا
گریانم دێت

٩١
بە دوای حیکمەتەکانی بووندا مەگەڕێن
ئێمە بە ڕێکەوت هەین
٩٢
ژیان چەمێکی دڵگیرە
ماسی چەرمەسەریی
تێدا ڕاو دەکەین
٩٣
لە سەرمدا
پیاوێکی مۆن هەیە
دووربینێکی قەوسی بەدەستەوەیە
بۆ هەر لایەک بڕوانێ
تەنها تاریکی دەبینێت
تەنها ڕەشایی...
٩٤
سەرچاوەی شیعرەکانم
کۆمەڵە ئیلهامێکن
لە مەڵبەندێکی تاریکەوە دێن
ئەوانیش ئازارەکانمن

٩٥

ئەوەندەی من بزانم
ژیان بۆ راڤەکردن نییە
بۆ چێژوەگرتنە

٩٦

دۆزەخی خۆم
بە فیردەوسی ئێوە ناگۆڕمەوە

٩٧

دڵتەنگی
رەگی گولییە
تا مردن لێم نابێتەوە

٩٨

ئەگەر ژیان
گوڵێکیش بێت
دڕکەکانی چواردەوری
من دەکوژن [١]

٩٩

من شوێنکەوتووی جوانی نیم
لە کۆششدام دەستم هەبێ
لە داهێنانی جوانیدا

---

[١] شاعیری ئەڵمانزمان "رینیە ماریا ریلکە" لە سالی 1926دا لە کاتی لیکردنەوەی گوڵیکدا، دڕکیک دەچەقیتە دەستی و بەو هۆیەوە تووشی خوینبەربوون دەبیت و پیی دەمریت.

١٠٠

بە عەقڵمدا ناچێ

خودای ئیبن تەیمیە

هەمان خوداکەی حەلاج بێ

١٠١

بەختەوەریی

ڕێکەوتنێکی گشتیی لەسەر نییە

باشتر وایە

خۆمانی پێوە سەرقاڵ نەکەین

١٠٢

هەڵەی ئێمە ئەوەیە

بە کۆگەلی بە دوای ئاسوودەییدا دەگەڕێین

ئاسوودەیی ئەگەر هەشبێت

دیاردەیەکی تاکەکەسییە

١٠٣

لە پشت گۆرانییە شادەکانیشمەوە

حوزنێکی تۆخ تۆخ هەیە

١٠٤

تا ئێستا جگە لە نووسەران

نەمبیستووە کەسێکی تر

کتێبی دزی بێت

١٠٥
زەمەن بازنەیەکی بەناو یەکدا چووە
دابەش نابێت بەسەر
رابردوو و داهاتوودا
١٠٦
گلگامێش
میوەی نەمریشی بەدەستهێنابا
گەر هەر لە میزۆپۆتامیادا بژیابا
لە جەنگی عێراق- ئێراندا دەکوژرا
١٠٧
لە مۆزەیەکی بچووک
لە ماوەی یەک کاتژمێردا
پاشماوەی دوو ئیمپراتۆرییەتی پانوپۆرم بینی
١٠٨
برینەکانم
بەدەم خۆشەویستییەوە
سەما دەکەن
١٠٩
مەرگ
لە رستەی ژیاندا
دوا وشەیە

١١٠

وا هەست دەکەم
شتێک بەسەر جیهان دێ
رەنگە ڤیرۆسێکی چاوکاڵ
کۆتایی پێبهێنێ

**"دیسامبەری ٢٠١٤ ئارنهێم - هۆلاند" تا "ئۆکتۆبەری ٢٠٢٠ بیلەفێلد- ئەڵمانیا". ئەم سەد و دە تێکستە، حەوت وڵاتیان کردووە "کوردستان، هۆلاند، ئەڵمانیا، دانیمارک، سوێد، ئێران، تورکیا".**

١

دۆزینەوەی شادومانی
لەسەر زەوی
لە دۆزینەوەی ژیان زەحمەتترە
لەسەر پلۆتۆ

٢

ئەگەر لە داهاتوودا
کەسێک بۆ خۆشویستن هەڵبژێرم
بێ چەند و چون
ئەو کەسە خۆمم

٣

سەرکێشییەکەم لەوەدایە
ئەو نهێنییانە ئاشکرا دەکەم
کۆمەڵگە ئیمزای کردووە
نابێ بدرکێنرێن

٤

لەبەرئەوە
رقم لە هەندێ شیعرم هەڵگرتووە
بە دڵی زۆرینەن

٥

ئەگەر لای ئەسخیلۆس
تراژیدیا دیاردەیەکی تایبەت بێ
بە بنەماڵەی خواوەندەکان
لەم سەردەمەدا، تایبەتە بە من

٦

هەتا گێلەکان مابن
چەمکی خۆشبەختیش دەمێنێ

٧

منداڵدانی خەیاڵ
لێوانلێوە لە بیرۆکە
رێ بدە لە دایک بن

٨

ژیانم چیرۆکێکە
دەستم لێ هەڵگرتووە
بزانم تا کوێ
خۆی دەگێڕێتەوە؟

٩

لە چاڵی سەدەی نۆزدە
دەرنەهاتووین
چاومان بڕیوەتە
سەدەی بیست و دوو

١٠
کە باسی فرەڕەنگی دەکەن
پەلکەزێڕینەم بیر دەکەوێتەوە
شتێک هەرگیز
دانابەزێتە سەر زەوی
١١
دەگریم
لە بری ئەسرین
تەنهایی بە چاومدا دێتە خوارەوە
١٢
ترسناکترین پانتایی
لە تەواوی بووندا
ژیانە
١٣
ژیان
فیلمێکی چەندە سامناک بێ
هێندەش کۆمیدییە
١٤
توانای شاعیران
لەسەرو توانای فەیلەسوفان و
لە خوار وزەی عاشقانەوەیە

١٥
دۆستۆیڤسکی
بۆ دانەوەی قەرزەکانی
رۆمانەکانی خۆی دەنووسی
بەڵام بەو کارە
هەموو مرۆڤایەتی قەرزار کرد
١٦
گەشبینی
کڵاوێکە دەخرێتە سەری گەمژەکان
١٧
خەونەکانم
"با" بوون، "با"یەک بردنی
شەپۆل بوون
شەپۆلێکی گەورەتر بردنی
١٨
لە دەروونما
شەڕێکی ناوخۆیی هەیە
تەرمی "من" لە کوشتارگەیەکدا
بۆ ئەبەد جێدەمێنێ

١٩
لە نێوان وجود و عەدەمدا
مرۆڤێک هەیە
لە چۆمی خەیاڵدا مەلە دەکا
٢٠
دەبوو نۆرەی لە دایکبوونی خۆم
بدایە بە یەکێکی تر
نێوانی لەگەڵ ژیان خۆش بوایە
٢١
تا دوور دوور بڕوانم
نزیک نزیک دەبمەوە لە خۆم
٢٢
دەست لە هەر تاکسییەک رادەگرم
دەمبات بۆ تەرمیناڵی خەیاڵ
٢٣
بۆشاییەکان
زۆرن و لە هەموو شوێنێکن
بەتایبەت لەنێوان مرۆڤەکاندا
٢٤
مەشق لەسەر دڵڕەقی دەکەم
بۆ ئەوەی رۆمانێک بنووسم
پاڵەوانەکانی
بە ناخۆشترین هەلومەرجدا تێپەڕن

٢٥

هەموو بلیمەتێک
لە بری پارەوپول
زیاد لە پێویست
تراژیدیای هەیە

٢٦

بەو هەموو کەم خەوییەوە
زۆرترین خەون دەبینم

٢٧

شتێکی گرنگم نەکردووە
تەنیا ئازارەکانی خۆم نوسیوەتەوە

٢٨

لە مێشکی هەر نووسەرێکدا
سەدان شەیتان هەیە

٢٩

پێناچێ ئادەم
یەکەم مرۆڤ بووبێت
یەکەم پەنابەر بوو
لەسەر زەوی

٣٠
کورد
گروپێک سیزیفن
بەردەکەیان لە "هەڵگورد"ەوە
خلۆر دەبێتەوە
٣١
بە دوامدا مەگەڕێن
من ڕستەیەکم
لە کتێبێکی ونبوو
٣٢
ویستم درۆ بکەم
ژیان وەک حکایەتێکی دڵخۆشکەر
بگێڕمەوە
٣٣
وا دەزانن لە ڕەشبینیدا دەڵێم
دنیا خوار و خێچە
چی بکەم دنیام وا ناسیوە؟
٣٤
ژیانی خۆش
ناخۆشترین جۆری ژیانە

٣٥

لە نێو هەزار کەسدا

بووم بە هاوڕێی خۆم

٣٦

شاشەی تەلەفزیۆن

ئاوێنەیەکی سیحرییە

هەموومان جوان نیشان دەدات

٣٧

لەم جیهانە نوێیەی ئەمڕۆدا

هیچ تازەیەک لە دایک نابێ

٣٨

خوێنەر

هەر کتێب ناخوێنێتەوە

نووسەریش دەکوژێت

٣٩

ئێمە

کاتێک لە خۆمان دەڕوانین

سەیری هیچ ناکەین

٤٠

شیعرنووسین

وەک لێخوڕینی ئۆتۆمبیلی ئۆتۆماتیک

ئاسان بووە

٤١

خەمۆکی

وەک گەردوون وایە

تا دێت دەکشێت

٤٢

نەک هەر ئازارەکان

هەموو شتەکان لای من

ماتریاڵی شیعریین

٤٣

هیچ بکوژێک نییە

هێندەی جوانیی

دڵڕەق

٤٤

ئەو شیعرەی لە بۆتەی لۆژیکدا

خۆی لە قاڵب بدات

مایەی پێکەنینە

٤٥

شیعرەکانم

هۆتێل بەلاش نین

تێیدا پاڵ بدەیتەوە

شەکەتت دەکەن

٤٦
زۆر کۆمیدیین ئەوانەی دەیانەوێ
ئەم جیهانە هەڕەمەکییە
سیستماتیک بکەن
٤٧
ئەفسانە مەزنەکان
لە دوامانەوە نین، لە پێشمانەوەن
٤٨
زانست تەقەلایەکە
بۆ بە واقیعکردنی ناوەڕۆکی ئەفسانەکان
٤٩
هەر دەقێکم
بۆ خۆی پۆرنۆگرافیکە
وەها خۆم رووت کردووەتە
هاتوچۆی بیرکردنەوەم دەبینرێ
٥٠
هیچ دووبارە ناکەمەوە
تەنها جاروبار
جەخت لە شتێک دەکەمەوە

٥١

هەموو مێژووی من

شەڕی دەستەویەخەیە

بۆ زاڵبوون بەسەر مندا

٥٢

مرۆڤی نوێ

هەست بە هیچ ناکات

تەنانەت بە وجودی خۆیشی

٥٣

زۆر سەیرە

بێ ئەوەی رۆژێک ژیابین

لەسەر جەستەی بیرەوەریی دەژین!

٥٤

مرۆڤ زۆر سەرقاڵە

ناپەرژێتە سەر داکەندنی جلوبەرگی

پەژارەش

٥٥

هەزار ساڵ تەنهایی

قوربانی چرکەیەک بێ

لەگەڵ یار [١]

---

[١] لە خەونمدا ئەمەم دەوت و دەنووسی، بۆ ساتی بیداربووومەوە و لەسەر لاپەڕەیەک نوسیم، دووبارە نوستمەوە.

٥٦

تا بە شاقوولی

بە ناخی خۆماندا رۆنەچین

تێناگەین چەند وەحشەتناکین

٥٧

با تفەنگەکان خامۆش بن

قیژە و هاوار بێدەنگ بکەن

مندالێم سەرخەوێک دەشکێنێ

٥٨

پرسیارە هەرە دێرینەکە

هێشتا تینووی وەڵامە:

بۆچی لە دایک بووین؟

٥٩

تا زانست

بەرەو پێشەوە بچێت

مرۆڤ بەرەو دواوە دەگەڕێتەوە

٦٠

ژیان

وەک بنی مەنجەڵ رەش داگەڕاوە

شاعیرێک خەریکی سپیکردنەوەیەتی

٦١

تەرمێکی سەر ئاو کەوتوو

لە پێش چاوی هەموو جیهان

چیرۆکی کۆچ دەگێڕێتەوە[١]

٦٢

بیر لە جمکێک دەکەمەوە

لە سکی دایکیاندا

چەند بەدبەختە ئەوەیان

چەند چرکە پێش ئەویتر

دێتە ژیانەوە

٦٣

کتێبە ئاینییەکان

بەڵێنی قەحپەخانە

بە مرۆڤ دەدەن

٦٤

بەشێک لە مێژووی پیاو

گەڕانە بەدوای

جێگەکانی سێکسفرۆشیدا

---

[١] ئەم رۆژانە "سەرەتای ٢٠١٦" دەریای ئیجە سەردیڕی دەنگوباسەکانە. هەر بەلەمی کۆچبەرەو لە دڵیدا نقووم دەبێت.

٦٥
مەسیح لە رۆژهەڵات
لە خاچ درا
رۆژئاوا بەسەرو زیادەوە
تۆڵەی لە رۆژهەڵات کردەوە
٦٦
عیسا
تاکە رۆژهەڵاتییە
زۆرینەی خەڵک لە خۆرئاوا
شوێنی کەوتن
٦٧
لە کۆتا دێڕی
هەر کتێبێکی عاشقانەدا
نووسراوە: چاوەڕوانی
٦٨
زۆر سەرسوڕهێنەرە
نووسەری کتێبەکانی بەختەوەریی
چۆن تا ئێستا
خۆیان نەکوشتووە؟!

٦٩

کتێبی ژیانم کردەوە
چاوم کەوتە سەر ئەم دێڕە:
سەرکەوتووترین کەس فاشیلەکانن

٧٠

ژیان گۆڕەپانی زیندانێکە
لە شێوەی نەخۆشخانەی جارنتۆن[١]
مەرگ ناوی رزگاربووان دەخوێنێتەوە

٧١

لەناو ئەو هەموو کوردە
ناکوردەدا
پیاوێک هەڵکەوت
ناوی "کوردی" بوو

٧٢

هاوڕێ
خەساربووین
ئێمە خەساربووین
لەم سەر زەوییە

---

[١] نەخۆشخانەیەکی دەروونــی نیمچە زیـنـدان بـووە لـە فـەرەنـسـا، لە ناسراوترین ئەو کەسانەی لـەوی تیراپی کراون "مارکیز دی ساد"ە. نەخۆشخانەکە پڕ بووە لە خەڵکی هەمەچەشن.

٧٣

ئەوەی بیەوێ

مێژووی راستگۆیی بنووسێتەوە

درۆزنترین کەس دەردەچێ

٧٤

سیاسەتمەداران

بە ئەمەکترین بوونەوەرن

بۆ درۆ

٧٥

مرۆڤ بۆ ئەوەی بتوانێ

درێژە بە ژین بدا

درۆی خۆشبەختی داهێناوە

٧٦

ئێوە باسی کام ژیان دەکەن؟

ئەوەندەی بزانم

ژیان دەمێکە مردووە!

٧٧

گەر سەرزەمین

هەر خۆم و بتەکانی تێدا بمێنێتەوە

ئارەزووی شکاندنی بتەکان

لە دەست نادەم

٧٨

کۆیلایەتی پێشان

ناچارکردن بوو

هەنوکە ئارەزوومەندانەیە

٧٩

ئەگەر هاوزەمانی نیتچە بوومایە

پێش ئەو

بڕوام بە هەقیقەت نەدەکرد

٨٠

بێ هیچ دوودڵییەک

خۆم بە ئیگۆیست دەزانم

چاک بم یان خراپ

هەر خۆمم

نامەوێ ببم بە کەسی تر

٨١

کە دەمرین

کەلێن لە ژیانی کەسدا

دروست ناکەین

کەلێنێک لە گۆڕستان

پڕ دەکەینەوە

٨٢

وەک ئەکتەرێکی سەرەکی
هەر لە دەسپێکەوە خزامە
فیلمی خۆشەویستی ژنێکەوە

٨٣

ئێمە هەموو کۆپی یەکترین
وێنەی بیرکردنەوەی یەکێکمان
بۆ گشتمان دەست دەدا

٨٤

بۆ بینینی مۆراڵ
لە ژیاری ئەمڕۆدا
هەزار چاومان پێویستە

٨٥

هیچ فیلمێکم نەبینیوە
هێندەی ژیانی من
تراژیدیی

٨٦

هەمەنگوای دەیگووت
"هەوڵدەدەم ژیان زیندوو بکەمەوە"
چونکە پێی نەکرا
خۆی کوشت

٨٧

ئەو نووسەرانەم خۆشدەوێ

بە زمانێکی سادە

ئاڵۆزیی دنیا شی دەکەنەوە

٨٨

سەد و پەنجا هەزار ساڵە

ئینسان فێری هونەری ژیانکردن نەبووە

لافی زۆرزانیش لێدەدات

٨٩

نەوەکانی داهاتوو

ئیرەیی بە ئێمە دەبەن

پێش گڕگرتنی زەوی

مردووین[١]

٩٠

کۆتایی بەڕێوەیە

منیش ئەم شیعرانە

بە تەواونەکراویی جێدەهێڵم

---

[١] ستیڤن هاوکینگ، فیزیازانی بەناوبانگ، پیشبینی ئەوەی کرد لە داهاتوودا لەشی زەوی هێندە گەرم دادی پلەی گەرمی دەگاتە ٤٦٠. بەوەش لە بری باران لە ئاسمانەوە کبریت دەباریت.

٩١
ژیان زۆر جوانە
یەکێک لە جوانییەکانیشی ئەوەیە
زۆر قورسە
٩٢
لە پشت هەر کاریکاتێرێکەوە
زامی قووڵ قووڵ و
چەند دڵۆپێک فرمێسک هەیە
٩٣
مرۆڤی بلیمەت و گەمژە
لە ئارادا نییە
تەنیا فریودانێکی رووت
لەم مەسەلەدا هەیە
٩٤
ئەگەر هیواداریی
بەروبوومێکی هەبوایە
ملیۆنان کەس
لە چاوەڕوانی مەسیحدا
سەریان نەدەنایەوە

٩٥

سەردەمانێک

من ڕەخنەم لە دەسەڵات دەگرت

دایکم بە چاوی بەزەییەوە

دەیبردم بۆ لای دکتۆری ئەعساب

٩٦

ماڵی تەکنۆلۆژیا ئاوا بێت

هیچ نهێنییەک نەماوە

خۆمان لە ناویدا بشارینەوە

٩٧

تا مرۆڤ کوشتن بمێنێ

هیومانیزم

ناونیشانێکی چەواشەکارە

٩٨

دەستم لە دنیای تازە شتوە

هەرچەندیش دەکەم

ناتوانم هێڵکاریی دنیای دادێ

بە ڕوونی بکێشم

٩٩

ژیان زۆر پیسکەیە
لە بەخشینی شادومانیدا
زۆریش سەخی
لە دابەشکردنی تەنگەدڵیدا

١٠٠

دەنگێک لە پشت ئاپۆراکەدا
هاوار دەکات:
ئەی غەمگین لەگەڵ تۆمە
تەنیا منم
ئاوڕ دەدەمەوە

١٠١

مێژووی ئێمە
تووڕەبوونی تێدا نییە
کێیە یەکەم یاخی
لەو دیرۆکە تووڕە دەبێ؟

١٠٢

کورد لەسەر خۆی
هیچ هیچی نەگوتووە
تەنها کڕوزاوەتەوە

١٠٣
گەر رۆمانێک بنووسم
هەوڵدەدەم جیهانێکی تازە بێت
بە دڵی خۆم
گۆرانی تێدا بڵێم
١٠٤
ئەگەر دەتەوێت
رێی ئازار ناوقەدبڕ بکەیت
ببە بە شاعیر
١٠٥
نەگبەتییەکە
ئەو رۆژە دەستپێدەکات
لە قەفەزی ساویلکەیی
دێینە دەرەوە
١٠٦
ئەو کاتەی نووسەرە کوردەکان
لە کۆلێژی غەڵبەغەڵب دەیانخوێند
بڕوانامەی کولێژی بێدەنگیم
بەدەستهێنا

١٠٧
قەرزاری دایکمم
هەر رۆژەو لە گرتووخانەیەک
منی کۆمۆنیستی دەردەهێنا
١٠٨
شارستانی هاوچەرخ
ماری کیلۆپاترا پیوەی داوە
هەموو لەشی ژارە
١٠٩
ژیانی من
لەسەر زنجیرەیەک هەڵە رۆنراوە
ترسناکترین هەڵەش ئەوەبوو
رێم دا فێری ئەبجەدیات بم
١١٠
ژیان زەحمەتە
لە ترسی زەحمەتییەکان
ژینی خۆت تاڵ مەکە
١١١
پرسیار لە بارەی ژیانەوە دەکەن
هێشتا فێرنەبوون
پرسیاری زیادە تەرک بکەن

١١٢
بە ڕاشکاویی پێتان دەڵێم
پیاوێکی ڕەشبینم
ناکرێ لەو حەشاماتە گەشبینەدا
یەکێکی ڕەشبین هەڵبکەوێ؟

سەرەتای ٢٠١٦ تا کۆتایی ٢٠٢٠
ئەم تێکستانە لە مێشکمدا بوون و نەخۆشخانە بە نەخۆشخانەی خۆرئاوای زەمین لەگەڵ خۆم دەمگێڕان، هەر جارەی یەکێک بە ژانەوە چاویان بە ژیان هەڵدەهێنا، لەگەڵ تروکانی هەر کامیاندا خوێنم دەڕشتنە سەر لاپەڕەیەکی سپی.

١

عەشق

تەختەسڕێکە

ئاسەواری عەقڵ دەسڕێتەوە

٢

بە ئەزموون بۆم دەرکەوت

هیچ مرۆڤێک

شایانی عەشق نییە

٣

کەمێک ژیریی بەسە

بۆ ئەوەی تێبگەین

خۆشەویستی کۆکاکینە

٤

عەشق

دوو کاری هاوکاتە:

هەڵهاتن لە واقیع

نقومبوون لە پانتایی مەجازییدا

٥

عەشق خومخانەیە

ڕۆژە سپییەکانی تێهەڵدەکێشین

٦

عەشق ئازاردەرە

بەڵام دەستە چەورەکەی

بە دابڕان دەسڕێتەوە

٧

قووڵایی قووڵاییەکانی

خۆشەویستی تێگەیشتووم

وای چەند چارە رەشم!

٨

شاعیران

هیچ لە خۆشەویستی ناچننەوە

جگە لە یەک دوو دیوانی غەمبار

٩

ئازارەکانی خۆمم خۆشدەوێ

بۆ نموونە خۆشەویستی

١٠

ئەوانەی خۆشەویستی

بە هەوەسبازیی تێگەیشتوون

گەر ببنە ڤیگتاریی

گرفتەکەیان بنبڕ دەبێ

١١
خۆشەویستی
ڕاگەیاندنی جەنگە
دژی خودی خۆت
١٢
عەشق کەس شاد ناکا
بەڵام پەیژەیەکە
بۆ گەیشتن بە گەورەیی
١٣
عەشق
نافورەی فرمێسکە
زۆرجاریش گڕکانی شیعر
١٤
خۆشەویستی بازدانە
لە چوارچێوە گەورەکەوە
بۆ بازنە هەرە تەسکەکە
١٥
خۆشەویستی
هەڵدانەوەی یەکەم پەردەیە
لە شانۆگەریی پەرچوودا

١٦

عەشق

تێپەڕینە بەسەر پردی سیراتدا

وریابە نەکەویتە خوارەوە

١٧

خۆشەویستی

فووکردنە لە مۆمی تەنهایی

١٨

خۆشەویستی

دەرچوونی تیرە لە کەوان

گەڕانەوەی نییە

١٩

ئای عەشق

چی بە من بەخشی؟:

لە یەک کاتدا

گریان و زەردەخەنە

٢٠

ژنان

ئەو راستییە باش دەزانن

پیاوان وەک راوە ماسی

لە خۆشەویستی دەڕوانن

٢١

خۆشەویستی

کتێبێکی تەڵیسماویی

بەر دەست نەخوێندەوارێکە

٢٢

خۆشەویستی

هەستێکی ناسروشتییە

هیچ ئیتۆلۆگێک ناتوانێ راڤەی بکا

٢٣

عاشق

کاهینێکی ورە رووخاوە

کەلاوەیەکی قەشەنگە

٢٤

عاشق

لە جیهانێکی مەییودا

بۆنی بێئۆقرەیی لێدێ

٢٥

ئەگەر هەوەسبازیی

گۆمێکی لێڵ بێت

خۆشەویستی کانییەکی روونە

٢٦
عەشق
مەلەکردنە بە پێچەوانەی شەپۆلی ژێرییەوە
بە کورتی
نغرۆبوونە لە ئۆقیانووسی شێتییدا
٢٧
ئیقاعێک لە قورگی عاشقدایە
شێوەی دەچێتەوە سەر مازۆخیزم
٢٨
بۆ هەمیشە عاشقان
لە دۆزەخێکی "ئەبیکۆر"یدا
نەمر دەبن
٢٩
عاشقان
فێ قورسەکانیان ناگۆڕنەوە
بە سووکە فێ[1]
٣٠
خۆشەویستی
دۆخێکی نائاساییە
کە هەموو شت تێیدا
ئاسایی دەبێتەوە

[1] لە دیدی "ژاک لاکان"دا هەر ئاویزانبوونێکی سێکسی سووکە فێیە.

٣١

خۆشەویستی

لە خەون دەچێت

هەم کورت

هەم مەرز ناناسێ

٣٢

عەشق و سیحر

هێندە لە یەکتر دەچن

بۆم جیا ناکرێنەوە

٣٣

لە فیلمی عەشقدا

دەرهێنەر بوونی نییە

هەموو ئەکتەرین

٣٤

باوەڕ ناکەم

هیچ عاشقێک هەبێ

دایکی نوشتەی بۆ نەکردبێ

٣٤

خۆشەویستی

راکردنە بەدوای سێبەری خۆتدا

٣٥
هەموو عاشقێک نیگارکێشە
وێنەی خۆی
لەگەڵ مەینەتدا دەکێشێ
٣٦
عەشق
عەینەکی زەڕبینە
یار لە خۆی گەورەتر نیشان دەدا
٣٧
عەشق تۆقێنەرە
تەنها لای ئەوانە دەمێنێتەوە
بەرگەی دەگرن
٣٨
عەشق
گرتەیەکی سێکسی نییە
ئۆرگازمێکی رۆحییە
٣٩
لەم سەردەمەی مرۆڤ
بووەتە رۆبۆتێکی سێکسی
من جارچی عەشقم

٤٠

فەیلەسوفە دڵخوازەکانم

هەمان رای عارفەکانیان هەیە

لەمەڕ عەشق

٤١

سێکس جوانە

لەویش جوانتر

عەشقە

٤٢

خۆشەویستی

قڵپکردنەوەی بەختەوەرییەکی رەشپۆشە

بەسەر خۆتدا

٤٣

سێکس و خۆشەویستی

بەهایەکی تازەیە

من پێکەوە گرێمداون

٤٤

خۆشەویستی

گوێ بۆ بەها باوەکان ناگرێ

بەهای خۆی هەیە

٤٥
عاشق دڵڕەقە
سێکس خەفە دەکات
ئەگەر دەسەڵاتی هەبا
سەری دەپەڕاند
٤٦
عاشق
سادیستێکی مازۆخییە
مازۆخییەکی سادیستە
٤٧
عەشق
ناوی خوازراوی کچێک بوو
تۆفانی نامووس بردی
٤٨
خۆشەویستییان
دیپۆرت کردەوە
بۆ دوو توێی دیوانەکان
٤٩
خۆشەویستی
گۆرانییەکی کوردیی بوو
فەتوا کرمەڕێزی کرد

٥٠

خۆشەویستی
نامەیەکی کراوەیە
بۆ هەموو کەس

٥١

لەوەتی عاشق بووم
باوەڕم بە دۆزەخ هێناوە

٥٢

لە عەشقدا
بەهەشت بوونی نییە
ئەوەی هەیە تەنها دۆزەخە

٥٣

یەکەمین عاشق
باپیرە ئادەم بوو
ئاوەکە لە سەرەوە رژاوە

٥٤

دۆزەخی عەشق
لە بەهەشتی تەنهایی
دلڕفێنترە

٥٥

کۆمارەکەی ئەفلاتۆن

بۆیە ناخۆشە

شاعیر و عاشقانی تێدا نین

٥٦

عاشقان

پێش مردنی فیزیکی

ون دەبن

٥٧

جوانی عاشق

وەک گوڵێک

لە ناو ناشرینییەکانی دنیاوە

سەری دەرهێناوە

٥٨

عەشق

تێپەڕینە بەناو حەشاماتدا

پەڕینەوەیە بەرەو یەک کەس

٥٩

مەعشوق لە کوێ بێت

نیشتمانی عاشق ئەوێیە

٦٠
ئیستاتیکای عەشق لەوەدایە
ناهێڵێت خەیاڵی مرۆ
بۆ هیچ کوێ سەفەر بکا
بێجگە لە ناوەوەی خۆی
٦١
عاشقان کەمدوو نین
بە زمانی دڵ دەپەیڤن
دڵیش ورتەی لە دەم دەرنایێ
٦٢
شیعر
هەمیشە لە هەوڵی بێوچاندایە
بۆ بەدەقکردنی عەشق
٦٣
عاشق
بە چاوێکی جیا
سەیری ژیان دەکات
٦٤
لە عەشقدا
یەک و یەک
یەکسانە هەر بە یەک
لە ماتماتیکی عەشقدا
دوو جێی نابێتەوە

٦٥

عەشق گۆمە

تا قووڵ بێت مەلەی خۆشترە

٦٦

کە جوانی دابەشکرا

عەشق پشکی شێری پێ بڕا

٦٧

بۆ ئەوەی هەموو ڕۆژەکانت

کۆپی یەکتر نەبن

عاشق بە

٦٨

عەشق

درەختێکی شەکەت و زەردهەڵگەڕاوە

گەڵای سەوز داپۆشیوە

٦٩

عەشق دەردە

دەرمانیشە

بۆ ئێش و دەردە تەقلیدییەکان

٧٠

مرۆڤ بە سروشتی خۆی ناشادە

سوچی عەشق چییە؟

٧١
شاعیر
لە هۆدە و هەیوانی عەشقدا
کرێچییە
٧٢
عاشق
تەمومژ لەبەر دادەکەنێت
ڕووناکی دەکاتە بەر
٧٣
عاشق
یەکەم کەسە
پەی بە ڕووناکیی دەبات
لە ئەشکەوتی ڕۆحدا
٧٤
عاشق
عاشقی ون بوونە
ڕەشۆکیش عاشقی دۆزینەوە
٧٥
عاشق
ڕەنگی زەرد زەردە
دڵیشی تا چاو بڕ دەکات
سەوزایی

٧٦
لای عاشق
کۆترە شینکەی بەختەوەریی
هەڵفڕیوە
چۆلەکەی مەزنیی لەناو گیانیدا
نیشتووەتەوە
٧٧
عەشق
هەڵهاتنە لەژێر عەبا رەشەکەی مەرگەوە
بۆ ناو کەژاوەی ژیان
٧٨
عاشق
گیتار بۆ هیچ گۆانیبێژێک ناژەنێت
خۆی سترانبێژە
٧٩
عاشق
لە وانەی ناسکیدا
سەد نمرەی هەیە
لە وانەی بوغزدا سفر

٨٠
عاشق
هەموو رۆژێ خۆی دووبارە دەکاتەوە
هەر رۆژەو بە چەشنێ
هەست بە دووبارەیی نەکەین
٨١
عەشق لاپەڕەیەکی سپییە
ئەشکی لەسەر دەنووسرێتەوە
٨٢
عەشق بە نیگا دەست پێ ناکا
بە تێڕامانە قووڵەکانەوە پەیوەستە
٨٣
دەسەڵاتی عاشق
لە قودرەتی خودایی دەچێ
لە هیچەوە زۆر شت دەخوڵقێنێ
٨٤
عەشق
گەمەیەکی زۆر کپە
دژی هەر ژاوەژاوێکە

٨٥
شاعیر
جوانی لە عاشق قەرز دەکات
٨٦
خۆشەویستی
دژی هەموو فیلمە رۆمانسییەکانە
٨٧
عەشق
پڕکردنەوەی هیچ جۆرە
سپەیسێک نییە
٨٨
عاشق
هەرچی بێت
فۆرمالیست نییە
٨٩
عاشق
بوونەوەرێکی ئەزەلییە
رەگەزی ناچێتەوە سەر کەس
٩٠
جوانی عەشق
مەتەڵێکی ئاڵۆز نییە
تەنیا دوورەپەرێزییە لە ناشرینی

٩١

دێوێکم

لە قوتووی کینەدا جێم نابێتەوە

مێرووویەکم

بە دەشتی خۆشەویستییەوە

دیار نیم

٩٢

بە جۆرێ لە عەشق تێگەیشتووین

دوورە لە خودی عەشق

عەشق هەڵگرتنەوەی

لاشەیەکی فڕێدراوی بە نەفرەتکراوە

٩٣

عەشق

ئارامییەکی شڵەژاوە

شلۆقییەکی هێمنە

٩٤

لە مرۆڤە مەزنەکانەوە

عەشقمان بۆ جێماوە

لە گرگنەکانیشەوە

هیچ

٩٥
ژنەکان
بە ستایلێکی نێرانە
حەوشەی عەشق گسک دەدەن
٩٦
رەنگە عاشق لە دایک ببێت
بەڵام عەشق
نە دایکی هەیە نە باوک
٩٧
جوانی دیاردەیەک سەر بە عەشق
نەک عەشق دیاردەیەک بێ
سەر بە جوانی

نۆڤەمبەر تاکو دیسامبەری ٢٠١٢

نۆ مانگە لەگەڵ شێرپەنجە دەست و پەنجە نەرم دەکەم. سەرئێشەیەکی بەهێز دایگرتووم، ژانەسەرێک تێناگەم ئەم هەموو ئازارە لە چ قوژبنێکی دنیادا خۆیان شاردبووەوە؟ شەوانێکی کپ و عاشقانەم لەگەڵ ئەم پۆستەرانەدا بەرێکرد، هەرچەند دەزانم لە زۆر شوێن بزرکاندوومە. رۆژانەش لەگەڵ ئازار و گۆڤارەکەمدا "گۆڤاری شەپۆل" بەرێدەکەم، هەرچەندە زۆر دڵسارد بوومەتەوە لە بەرامبەر کاری رۆژنامەوانی.

١

ئەگەر کەمێک لە زەوی

دوور بکەوینەوە

دۆزەخیش نامێنێ

٢

ژیان نامەیەکی دەستوخەتە

نەوەکانی کیبۆرد

بە حونجەش بۆیان ناخوێندرێتەوە

٣

لە ناو هەموو شیردەرەکاندا

مرۆڤ

ترسنۆک و زیرەکترینیانە

٤

خشۆکێکیش دەژی

دۆلفینەکان دەزانن سۆز چییە

بە تەنێ بیرکردنەوە

تایبەتە بە مرۆڤ

٥
مرۆڤی هەنووکە
هەمیشە سەرقاڵە
سێ بەشی ژیانی
لە فەزای مەجازیدا بەسەر دەبات
٦
زۆر جار
هیچ نەگووتن
هەڵوێستێکی رادیکاڵانەیە
٧
خوێندەوارە ئەکادیمییەکان
کوشندەترین جۆری نەخوێندەوارن
٨
مارکس و جۆن لۆک
ئەفلاتۆن و مەکیاڤیلی
هۆبز و گۆران
دریدا و قانع
لە کتێبخانەکەمدا
کۆبوونەوەیان هەیە

٩

ڕێگا نادەن بچمەوە وڵات
ئەو گەمژانە نازانن
لە ڕێی بیرۆکە ترسناکەکانمەوە
هەمیشە لەوێم

١٠

دونیا
یەک شادومانی مەزنی هەیە
ئەویش ئاشکراکردنی نهێنییەکانێتی

١١

بە تووڕەیی و ڕەشبینی
بە گژ ژیاندا دەچمەوە
ئەمە ستایلی منە
تۆش هەر چۆنێکی ئازادیت

١٢

هیچ کەس
هێندەی ئەوانە دژە خودا نین
لافی ئەوە لێدەدەن
ئەو هەموو شتێکی بە پێرفێکتی ئافراندووە

١٣

ڕوونبینی

کێشەیەکی جەوهەرییە

گەندەڵبوونی جیهانی لێ دەکەوێتەوە

١٤

خۆشبەختی

دوعایەکی کلاسیکی بوو

لە زەمەنی داپیرانماندا

ئەوساش گیرا نەبوو

١٥

ژیان

لە کەمپی زۆرەملێی ئاوشویتز دەچێ[1]

هەر کەسێک

سواڵی چەند چرکەیەکی تری تەمەن دەکا

١٦

نهێنی ئەوەی خۆشبەخت نیم ئەوەیە

بەو نەزانینییەی خۆمەوە

دەستەکەی ژیانم کەشف کردووە

---

[1] ئۆردوگایەکی زۆرەملیی نازییەکان بوو، ساڵی ١٩٤١ لە پرۆسەی ئامادەسازیی بۆ هۆلۆکۆست بیناکرا, ژمارەی کوژراوانی ئەم ئۆردوگایە لە نزیکی یەک ملیۆن و نیو جولەکەدایە لە ڕێی فڕنی سووتاندنەوە.

١٧

دروشمە بنەڕەتییەکان

لە شۆڕشە نوێکەی مندا:

با ئازادیی ئازاد بکرێت[1]

١٨

کێشەکە دەستمە

گوڕی ئەوەی تێدا نەماوە

دەمانچەیەکی مرومۆچ

لەسەر سەرم راگرم

ناڵە لە مێشکم هەڵسێنم

١٩

لە ریزی یەکەمی مردندام

چون ژیان

بە پاڵ پێوەنان

بۆ دوای دواوەی بردووم

٢٠

بۆ من جیاوازیی نییە

لە دونیادا ماندوو بم

یان لە گۆڕدا پشوو بدەم

---

[1] یەکیک لە دروشمەکانی شۆڕشی قوتابیانی فەرەنسا لە ١٩٦٨دا بریتی بوو لە"با قەدەغەکردن قەدەغە بکریت".

٢١

لە کۆڵانەکانی بیرەوەرییدا

ئیرەیی بە خۆم دەبەم و

وەک هەنارێک شەق دەبەم

٢٢

تا خۆم لە پشتی خۆمەوە

وەستابم

هەرەسهێنانم ئەگەرێکی دوورە

٢٣

شیعری من

نە لە ئێستادایە

نە لە رابردوودا

لە داهاتوودا ئەدرەوشێتەوە

گەر تا ئەوکاتە شیعر بمێنێ

٢٤

نە پێشگۆیی دەکەم

نە رمڵ لێدەدەم

ژیان وەک رابردوو

چەشنی ئێستا

بە دەردەسەرییەکانی خۆیەوە

بەرەو ئایندە بەڕێوەیە

٢٥

پۆستەرێک
بە دیواری مێشکمەوە هەڵواسراوە
لەسەری نوسراوە:
یاخیبوون

٢٦

سروشتی کاپیتالیزم وایە
هەموو کەس
غەمبارانە شاد دەکات

٢٧

چونکە دوای خۆم کەوتم
هەموو کەسم توورە کرد
هەموو کەسیشم جێهێشت

٢٨

ئەکتەرێکی سەرسەختم
لە فیلمی ململانێدا
بە ئاسانی ناخرێمە پەراوێزەوە

٢٩

ئەگەر توانای
سووتانت نییە لە ئاودا
باشترین بژاردەت لە بەردەستە:
خۆتم لێ دوور بگرە

٣٠
ئاسانترین ئیش
چاندنی وەهمە
لە مێشکی رای گشتیدا
٣١
رای گشتیی
تەنیا یەک مێشکە
ئەوانیتر تەنها سەرن
٣٢
چ گاڵتەجارییەکە
ئەو هەموو فرمێسکە
لە یەک دێڕ هەواڵدا
کورت بکەیتەوە؟!
٣٣
هەرچی بکەین
ناتوانین نائومێدیی دووربخەینەوە
هۆرمۆنێکە بەناخماندا
دێت و دەچێت

٣٤

لەناو هەموو رۆحلەبەراندا

مرۆڤ باسی رەوشت دەکات

لەناو مرۆڤەکانیشدا

یەک گرام ئەخلاق بوونی نییە

٣٥

جلە تەڕەکانی

رۆحی دەریا دەگوشم

تنۆک تنۆک

غوربەت دەچۆڕێ

٣٦

بۆ ئەو شتانە دەنووسم

کەنارخراون

بۆ نموونە گیان دەکەمەوە

بە بەری خۆشەویستیدا

٣٧

شارستانی کلیک

پەراوێزخستنی ئەو ژیانەیە

دەبوو لەناویدا بژین

٣٨
خۆ من
هیچم لە دنیا نەدەویست
هەموو شتێکم دەویست
٣٩
تا کۆتایی
هەر بە منداڵی دەمێنمەوە
منداڵێکی لاساری دژە کاپیتالیزم
٤٠
هەمیشە لە بەرەی دۆڕاوەکاندام
بۆ تا ئێستا روویداوە
بۆ یەک جاریش
ئینسانییەت براوە بووبێ؟
٤١
ئێمە لەسەر زەوی
لە بەلەمێکی خەیاڵیدان
بە پێی نەخشەیەکی وەهمی
بەرەو کەناری شادیی
سەوڵ لێدەدەین

٤٢
ئەوەی ناسکە
مرۆڤ نییە، ڕێواسە
٤٣
دووجار هاتوومەتە دنیاوە
جارێک لە دامەنی دایکمەوە
جارێکی تریش
لە ئامێزی یاردا
٤٤
لە زەمەنی ژیریی دەستکرددا
ئەو مرۆڤەی سترێس نەبێ
کاری کەوتووەتە
لای پزیشکی دەروونی
٤٥
ساڵانێکی زۆر لە ڕێی گوتنەوە
پرۆتستۆم دەکرد
هەنووکە لە ڕێی هیچ نەوتنەوە
٤٦
شیعر
نیشاندانی جیهانێکی ترە
لەودیو جیهانی ئامادەوە

٤٧

شیعر

سەری شاعیر دەخواتْ

لۆرکا و بەکر عەلی

دوو نموونەی زیندوون

٤٨

تا دروستبوونی چەکی ئەتۆمی

ئاپۆکالیپۆس

ئەندێشەیەکی خورافی بوو

٤٩

لە میترۆپۆلیسەکاندا[١]

نرخی یەک گرام ژیان

بەرامبەر بە یەک تۆن

نامۆبوونە

٥٠

بۆ تەمەندرێژیی شیعر

وا پێویست دەکا

بە ڤاکسینی فیکر خۆی بکوتێ

[١] میترۆ پۆلیس: شارە گەورەکان کە مودیرنیتە بەرهەمی هیناون.

٥١
هاوڕێ دێرینەکانم
بە زمانی ئەمڕۆ
نەیارە نوێیەکان
ئەوەندەی کاتیان بۆ دژایەتی من
تەرخان کرد
نیو هێندە کاریان کردبا
دەبوونە ملیۆنێر
٥٢
شارستانی تازە
ئەوپەڕی کۆنە
پلەیەکیش لەسەرو کۆنەوەیە
٥٣
لەم دنیا کەم خوێنەدا
شادومانی گریمانەیەکە
لە شێوەی جەنگی ترۆی[1]
٥٤
کە پێدەکەنم
تەمەنم سەرو سەد ساڵە
کە دەگریم
تەمەنم خوار پێنج ساڵە

[1] جەنگیکی ونە لە نیوان خەیاڵی میتولوژیی گریکی و ژیانی ریالیتەدا، دیار نییە ئایا جیهان جەنگیکی وەهای بە خۆیەوە دیوە؟!.

٥٥

هەموو رۆژێ
گشت شەوێک
برادەرە خوێڕییەکانم
ئەوانەی چارەیان ناوێم
لە رێی زەمکردنمەوە
دەمگەڕێننەوە ناو خۆیان

٥٦

زەوی
ماشێنێکی رزیوە
بارێکی لێ نراوە
سەد هێندەی خۆی قورسە

٥٧

ئەگەر دۆنادۆن راست بێ
گوومانم نییە
هەر سیاسەتمەدارێک
پێشتر چوارپێ بووە

٥٨

زۆر بێزارکەرە
لە کۆتایی هەموو شتێکداین
بە دەست ئەم هەموو دەستپێکەوە
کە زانست بەرهەمی دەهێنێ

٥٩
گەر خەونی گەورە نابینی
قبوڵی مەکە
لە چاوەڕوانیی خەونە بچووکەکاندا
پرچی خۆڵەمێشی بهۆنیتەوە
٦٠
شەرت بێ
ئەم هەموو عەزابەی ژیان
بۆ خودا بگێڕمەوە
ئەگەر ئەویش
پێم پێنەکەنێ!
٦١
لە کتێبخانەی ماڵەوە
چەندان کتێبی مەترسیدارم هەیە
لەوانە ماین کامپف[1]
هێشتاش نەموێراوە
کتێبێکی شۆپنهاوەرم هەبێ
٦٢
زۆر باش دەتوانم
خۆشەویستی بکەم
کاتێ داوای ڕاڤەکردنیم لێ دەکەن
قسەکردنیشم بیر دەچێتەوە

[1] تیکۆشانم "ماین کامپف" ناو تاکە کتیبەکەی "ئادۆلف هیتلەر"ە.

٦٣
تەمەنی بەختەوەریی
هێندەی عومری تەمێکە
بەسەر پەنجەرەیەکەوە ،
٦٤
چارەنووسم
لە شەمەندەفەرێکی تیژڕۆدایە
کە وەکو مار دەفیشکێنێ
خۆشم نازانم بەرەو کوێ!
٦٥
ژیریی دەستکرد
کارێکی پێ کردووین
هەمووانی وەک بولبوک
لە قەفەسی خۆی ناوە
٦٦
کەرەنتین
مرۆڤی وەک کۆتری ماڵی
لە کولانە ناوە
٦٧
ئەو مێژووەی جرجەکان دەینووسنەوە
گشت رووداوە گرنگەکانی
لە زێرابەکاندا دەقەومێت

٦٨

ئەوەی لە هەرزەکارییەوە
تا ئەمڕۆ لەگەڵمدا هاتووە
لەگەڵیشما دێت
بۆ ژێر چادری ئاییندە
ئازارەکانمە
ئازار

٦٩

زوو زوو شتم لێ ون دەبێ
کلیلی ماڵەوەم لە پاسدا
بزر کرد
دەفتەرێک شیعرم لە قیتاردا
ون کرد
شوێنێکم دەست ناکەوێ
لە هەزار برین
تاکە برینێکی تێدا ون بکەم

٧٠

کە خوشکەکانم یەک لە دوای یەک
مەرگ رفاندنی
تەنانەت نەمتوانی
ببمە زێوانی مەرقەدی گریان

هەر ئەوەندەم پێ کرا
یادگارە جوانەکانیان لای خۆم هەڵگرم
٧١
چ شورەییەکە
ڤایرۆسێکی وردیلەی بەچاو نەبینراو
ئیمپراتۆریا مەزنەکانی بە چۆکدا هێناوە!
٧٢
ژیان پەڕینەوەیە
لەم تونێلە تاریکەوە
بۆ ئەو تونێلە رەشەی تر
٧٣
ئاگاداری ئەوە نیم
لە جیهاندا هەم یان نیم
بەڵام لەوە دڵنیام
جیهانێک لەناو مندا هەیە
جیهانێکی ئاڵۆز
٧٤
ترسم لە هیچ نییە
ترسم لە هەموو شتێک شکاوە
هەرچی شتە مەترسیدارەکانە
خۆیان لەسەر من تاقی کردەوە

٧٥

یەکەم هەنگاوی تێگەیشتن لە جیهان
بە تێگەیشتن لە خۆت دەستپێدەکا
هەر مرۆڤێکیش هێندەی پشیلەیەک
لە خۆی تێدەگات

٧٦

دژی رای گشتیم
ئەو دۆخە سایکۆلۆژییە
تاکێتیم تیرۆر دەکات
نامەوێت جارێ بکوژرێم

٧٧

زۆر بە راشکاویی پێی لێ دەنێم
مرۆڤێکی پارۆنیم
گومانم لە هەرچی هەقیقەتە هەیە

٧٨

لە ناو چل و چوار هەزار پێغەمبەردا
یاقوبی کوڕی ئیسحاقم خۆشدەوێ
تاکەکەس بوو
وێرای مەرج بەسەر خوادا بسەپێنێ

٧٩
جاران عەقڵ
ڕێگەی نەدا خۆم بکوژم
ئەمێستا عەقڵ خۆی
چاوساغمە بەرەو دەرەوەی ژیان
٨٠
هەر بە تەنها پایز
بە ڕەمزی هەڵوەرین نازانم
هەر چوار وەرزەکە
وەک چوار برای تەبا
دەستیان لەناو دەستی یەکە
٨١
مرۆڤ پێش ئەوەی
سەرئێشە بێت بۆ زەوی
یان گێرەی گەردوون تێکبدا
خەریکی هەڵکەندنی گۆڕە
بۆ خۆی
٨٢
شتێک مایەی دڵخۆشیمە
پێش کۆتاییهێنان بە زەوی
مرۆڤ خۆکوژیی دەکات

٨٣
داپیرەم دەیگووت
هەرگیز بانگی گریان مەکەن
سەیر لەوەدابوو
تەلەفۆنم بۆ پێکەنین دەکرد
گریان وەڵامی ئەدامەوە!!
٨٤
زانست پێداگریی دەکات
تۆوی چی لە بیرکردنەوەدا بچێنی
ئەوەش دەدوریتەوە
لە دۆخی مندا
زانست تووشی خەجاڵەتی بووە
٨٥
مرۆڤ زۆر شتی داهێناوە
بەڵام تا ئێستا بارۆمەترێکی دانەهێناوە
دڵڕەقییەکانی دەستنیشان بکا
٨٦
ماڵەکەم برمێ
بەسەر پیتەکاندا دەڕوخێ
کە دەستی یەکتریان گرتووە و
لە وشەی "خۆشم دەوێی"دا
بەسەر یەکترا تواونەتەوە

٨٧

دنیا لەو چرکەساتەوە کاول بوو
لەو کاتەوە غەزەب داباری
پیاو
دەسەلاتی خواوەندە مێینەکانی
لەسەر زەوی نەهێشت

٨٨

شارستانی تازە
درێژکراوەی نێرسالارییە
تەنها سەری مەنهۆلەکە
لە زێڕ دروستکراوە

٨٩

ناخم، دەفرێک شیرە
لەسەر تەباخێک جێهێڵدراوە
هەر لە هەڵچووندایە

٩٠

دەمانچەیەک لەژێر سەرینەکەمدایە
یەک فیشەکی تێدایە
دامناوە بۆ یەکێک لە ڕۆژەکان
مێشکی خۆمی پێ بپژێنم

٩١
ژیانم یەک فیشەکی تیا ماوە
ئەویشم هەڵگرتووە
بینێم بە نەوچەوانی ئەو دەعبایەوە
ناوی گەشبینییە
٩٢
شیعر
گیان بەبەرداکردنەوەی ئەو وشانەیە
لە گۆڕستانی قامووسدا نێژراون
٩٣
لە دەسەڵاتی شیعردایە
لە دەروونی زبرترین وشەوە
ناسکترین مانا دەرکێشێ
٩٤
بە شیعرەکانم
دڵتان نادەمەوە
لە باشترین حاڵدا دەتانتەزێنم
تۆش کە ئەم دێڕە دەخوێنیتەوە
دەتەزیت

٩٥

به شيعر خۆم داپۆشيوه
شيعرەكان لەبەرم داكەنن
به جۆرێ رووت و رەجاڵ دەبم
كەس نامناسێتەوه

٩٦

پەشيمانم لەو كاتانەى
له رۆژنامەكەمەوه
غەمه گشتييەكانم
لەسەر حيسابى غەمه تايبەتييەكانم
دەورووژاند

٩٧

پۆستەچييەكى فزوڵ بووم
هەموو نامەكانم دەكردەوه
نامەيەكم نەبينى
بەوانەى پيرۆزبايشەوه
روويان گرژ نەبێ

٩٨

زاناكانى دەمارزانى دەڵێن
غەمباريى وجودى نييه
شتێك بوونى نەبێ
به چ قاچێك خۆى دەكات
به مێشكماندا؟

٩٩
لە شەپۆلی چوارەمدا
کەس لە تۆفانی ڕاڕایی
دەربازی نابێ
نوح بەخۆی و کەشتییەکەیەوە
لەنێو سترێسدا نقووم بووە
١٠٠
نە پرسیارەکان کۆتاییان دێ
نە گومانەکان
وەڵامەکانیش بۆ کەمکردنەوەی
ڕاددەی ئەو شکانەن
لە ناواخنی پرسیارەکاندان
١٠١
هەموو سەردەمێک
پرسیاری تایبەت بە خۆی هەیە
بە وەڵامە کۆنەکان
ڕازی نابێت
١٠٢
بیرکردنەوە هەیە
کانییەکی کوێرەوە بووە
بیرکردنەوەش هەیە

رووبارێکی سازگار
جوانترینیشیان ئەو بیرکردنەوەیە
وەک دەریا شەپۆلاویی

١٠٣

وەک یۆگییەکان
بڕوام بە مردنی ڕەها نییە
ئەوەی هەیە
پەرتبوون و شی بوونەوەیە

١٠٤

خۆر
شانی خۆی لە تاریکی دەتەکێنێ
ئێمە لەسەر زەوی
بەو تۆزە دەڵێین ڕووناکی

١٠٥

کتێبخانە
گۆڕی بە کۆمەڵی کتێبەکانە

١٠٦

خەون
بێ ڤیزا و پاسپۆرت
لە چەند چرکەیەکدا
دە گەلە ئەستێرەت دەگێڕێ

١٠٧

خەیاڵ

کەشتییەکی فەزاییە

وەستان ناناسێ

١٠٨

لەم دنیا پان و پۆڕەدا

جێم نابێتەوە

بیرکردنەوەم

لە جیهان بەرینترە

١٠٩

لە هەستی هەر شاعیرێکدا

زمانێک هەیە

پەیوەندیی بەو بەندییەی

نێوان هەردوو گوپەوە نییە

١١٠

بەوەی باشە

مرۆڤ لەسەر زەوییە

کێ بەرگەی دە ساڵی دەگرت

لەسەر ئۆرانۆس[1]؟

---

[1] یەک ساڵی هەسارەی ئۆرانۆس هاوتای 84 ساڵی زەوییە.

١١١
خەریکی نووسینی شیعرێک بووم
دێڕێک بەسەرمدا قیژاندی
هێی برادەر
دەستم لێ هەڵگرە
من لەگەڵ ئەو رستانەی تردا ناسازێم
١١٢
لە شارستانێتی لایکدا
مرۆڤی هەرە دواکەوتوو ئەوەیانە
فەیسبوکی نییە
منیش برایەکی دواکەوتووم هەیە
١١٣
دوای جیابوونەوەمان
لە باپیرە شامپازی
یەکەم گەمە
فێری رووخسار گۆڕین بووین
١١٤
مێژووی پەیدابوونی ماسک
هێندەی تەمەنی مرۆڤە

١١٥
باپیره ئادەم
یەکەم ماسکی لە گەڵا داهێنا
گەڵوگونی پێ داپۆشی
١١٦
پێکەنین
گۆرانییەکی شاد بوو
کۆمپانیاکانی ریکلامسازیی
داگیریان کرد
١١٧
هیچ مردوویەک
ماوەیەکی درێژ لە گۆڕدا پاڵ ناداتەوە
هەموو شتێک
دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی خۆی
١١٨
بە یەک وشە
مێژووی مرۆڤ بریتییە
لە مێژووی چەپاندن

١١٩
لوتکەی مۆراڵ لە سیاسەتدا
سوکایەتییە
کاری من ئەوەیە
سوکایەتی بەو سوکایەتییە بکەم
١٢٠
تەکنۆلۆژیا
هێندە دڕندەیە
سڵ لە هاککردنی مرۆڤ ناکاتەوە
١٢١
مرۆڤ بە زگماکی کوێرە
هیچ بوونەوەرێکی تر نابینێ
جگە لە خۆی
١٢٢
بە پێی فەرهەنگی من
موفرەدەی مرۆڤسالاریی
هاو واتای دڕندەییە
١٢٣
ئیشی من
لەم سەردەمە تازەیەدا
نوێکردنەوەی گومانە کۆنەکانە

١٢٤
نم نم بارانە
دڵۆپەکان لەسەر پەنجەرەکە دەمرن
منیش لە بیرکردنەوەدا
نقوم دەبم
١٢٥
هیچ شتێکی سروشتی نەماوە
خەیار دەخۆم تامی هەرمێ ئەدا
هەنجیر ئەڕنم شێوەی لە گندۆرە دەچێ
عاشق دەبم، بۆنی دابڕانم لێدێ
١٢٦
چرا
وەک ناوی خۆی رووناکی لەبەرە
مارەکانیش
لە دڵڕەقی زستان تێدەگەن
تەنها مرۆڤە
کتێبی ژیانی بۆ ناخوێنرێتەوە
١٢٧
ژیان
درامایەکی ناکۆتایە
هەر ئەڵقەو گۆبەندێکی تێدایە

١٢٨
ژیان یاسای رووبار پەیڕەو دەکات
ئەگەر مەلە نەزانی
بە خنکاویی کەنارت دەخات
١٢٩
غەمگینی
بە هێواشی پەنجەرەکە دەکاتەوە
وەک ئەوەی دەرگا لەسەر شادیی دابخا
١٣٠
بە دوای خۆمدا دەگەڕام
لە ژنێکدا
ئەویش بە دوای خۆیدا وێڵ بوو
لە پیاوێکدا
ئەو پیاوەش من نەبووم
١٣١
لە خواری خوارەوەی رەشبینیدا
پیاوێکی هێمن هەیە
تیشێرتێکی رووناکی لەبەردایە
بە هەموو شتێک پێدەکەنی

١٣٢

هەرچەند رەشبینیم لێ بتکێ
هێشتا بۆ ئەوە دەشێم
بە پێنووسێکی دڵتەڕ
قەسیدەکانی عەشق بنووسمەوە

ئەم کۆمەڵە تێکستە بەرهەمی دە ساڵی تەواون، لە حوزەیرانی ٢٠١١ تاکو حوزەیرانی ٢٠٢١. بەڵام لە نیوە زیاتریان لە دوای ٢٠١٩ەوە نوسراون. هەرجارەو تێکستێکم وەک باری سەرنجم لەمەڕ ئەو هەلومەرجەی تێیدا ژیاوم نوسیوە، بەنیازی چاپکردنیان نەبووم، کاتێکم زانی بینیم لە ماوەی ئەو دە ساڵەدا کە جۆرێکیش خەڵوەتنشینیم پێوە دەرکەوتبوو، بە جۆرێک کەڵەکە ببوون، نەمدەزانی چییان لێ بکەم! جا خراپ بن یان چاک بڕیارمدا چاپیان بکەم، هیوادارم ئەگەر لە بەرهەمە چاکەکانیش نەبن، نەچنە ریزی هەرە خراپەکانەوە، ئەگەریش چوون، با ئەمەش لەسەر ئەو خەرمانە خراپەی کتێبی کوردیی بێت، کە من لێرەدا ناتوانم مەزندەی ژمارەیان بکەم.

١

بە دونیادا گەڕام
هیچی نوێم نەبینی
بەناو خۆمدا پیاسەیەکم کرد
کەوتم بەسەر بێستانی
دەیان بیرۆکەی تازەدا

٢

لە فۆتۆ خانەوادەییەکانماندا
بە جۆرێک وەستاوم
وەک بڵێی ئامادەم
لەو وێنانە بێمە دەرێ

٣

جیهان بەو فراوانییە
جێگەیەکی چکۆلەی داگیرکردووە
لە ئەندێشەی مندا

٤

خەمۆکیی
لە کۆڵانە تەمومژاوییەکانی خۆیدا
چاوشارکێمان لەگەڵ دەکا

٥
بیرۆکراسی دەمانچەیەکی بێدەنگە
رەنگە رۆژێک
لە ژێر کاغەزی پۆستەکاندا
تەرمەکەم بدۆزنەوە
٦
من لە من بێزارە
خۆم چارەی "خۆم"ی ناوێت
نازانم ئێوە چۆن
بەرگەی من و خۆم دەگرن؟
٧
تەکنۆلۆژیا
چراکانی ئاسمانی کوژاندەوە
ئەستێرە سەرگەردانەکان
بەکۆڵێک تیشکەوە
بۆ پەناگەیەک دەگەڕێن
٨
مرۆڤ ویستی
کەڤاڵی دونیا بە ئایدیاکانی
برازێنێتەوە
سەرئەنجام دزێوی کرد

٩

دونیا
له موبیلی ماڵەکان
خێراتر دەگۆڕێت
لەم ماراسۆنە شەکەتەدا
مرۆ پێی ناگاتەوە

١٠

ئەوەتی مرۆڤ هەیە
شانازیی بە نینۆکەکانییەوە دەکا

١١

من و شەهوەت
لەسەر راستە شەقامی هەوەس
پێچەوانەی یەکتر دەڕۆین
ئەو بەرەو خوار
من بەرەو ژوور

١٢

کتێبە مێژووییەکان
ئاو لە گۆزەی رابردوو دەخۆنەوە
بە بەردەوامی تینوون

١٣
تەورات
رۆمانێکی ئۆنتۆلۆژییە
سەراوڕێژیشە لە چیرۆکی ئیرۆتیکی
١٤
ئەگەر رازی بین بەوەی
شیعر گواستنەوەی هەستە
لە رێی زمانەوە
دەبێت دان بەوەشدا بنێن
هەستەکان لە ئاوێزە دەچن
١٥
شیعری من
مەرزی سەدەکان دەبڕێ
ئەگەر رەخنەگران لێ بگەڕێن
١٦
وازم لەوە هێناوە
دنیا راڤە بکەم
چاوەڕوانی ئەوەم
دنیا خۆیم بۆ شەرح بکا

١٧
ئەوروپا
ناشوێنێک بوو منی قۆستەوە
فیشەکێک بوو لە دەستم دەرچوو
١٨
لە رێی بیرەوەرییەکانەوە
دەکەومە کاسە شەرابی رابردووەوە
بیر دەکەمەوە
رابردوو هێندەش تاڵ نەبوو
گەر خەسارمان نەکردبا
١٩
عەسری بێتامییە
تەنانەت ئازارەکانیش
تامی پێشوویان نەماوە
٢٠
خۆزگە
مرۆڤیش یەک رووخسار و
حەوت رۆحی هەبوایە
٢١
جگە لە شکست
گاز لە هەر سەرکەوتنێک دەگرم
ددانەکانم دەشکێن

٢٢
زۆر سەختە
بە رابردووت پێبکەنیت
بۆ ئایندەش بگریێی
٢٣
هەوڵمەدە
بەراوردم بکەیت بە کەس
هیچ نەبێت بەهۆی نەگبەتییەکانمەوە
لە کەسی تر ناچم
٢٤
باوکم سوکرات بوو
بێ ئەوەی هیچ بنووسێ
یاخیبوونی فێر کردم
٢٥
منداڵێکی هێندە بێدەنگ بووم
دایکم خەریکبوو پەلم بگرێ
بۆ قوتابخانەی لاڵەکان
٢٦
تا لە شاشەی بیرکردنەوەوە
دنیا نەبینین
هیچ کات لێی تێناگەین

٢٧

کە وتم بڕۆ بە ڕێگەی خۆتدا و
نرخت بۆ قسەکەم دانەنا
زۆرتر عاشقت بووم

٢٨

هێندە قووڵ
دەیڕوانییە چاوە دەریاییەکانم
وەک ئەوەی
سەیری ئاوێنە بکا

٢٩

ئەوەی لە ژیاندا
بە هەزار دەردەسەری بەدەستی دەهێنین
مەرگ زۆر بە سانایی
گسکی لێ دەدا

٣٠

دڵەڕاوکێ وەک زەروو
خوێنی شیعرم دەمژێ
تا نەمکوژێ لێم تێر نابێ

٣١
غوربەت هەموو شەوێک
دووپشک ئاسا
بەو خەونانەوە دەدا
بە نیشتمانەوە دەیانبینین
٣٢
مەنفا
خەیاڵەکان دەسڕێتەوە
جوگرافیای تێڕوانین
تەسک تەسک دەکاتەوە
٣٣
بازنەی ئارەزووم
تا دێت فراوانتر دەبێ
من ئارەزوویەکی گەورەم
لە دنیایەکی بچووکدا
٣٤
نیولیبرالیزم
هەموو مرۆڤایەتی
وەک تابلۆیەکی شێواو
گرتووەتە چوارچێوە

٣٥
ئەگەر دەتەوێ
لەبەرچاو نەبێت
پەنجەرەکانی سۆشیال میدیا
لەسەر خۆت دابخە
٣٦
رۆژئاوا
جێگەی خۆدۆزینەوە نییە
کەنداوی ون بوونە
٣٧
رارایی
چەشنی دەوەنێکی چڕ
مێشکی داپۆشیوم
٣٨
هەموو پێکەنینێک
بەژێر لێوەوەبوونی
کانییەک فرمێسکە
٣٩
خۆر قاپوتی تیشکی لەبەردایە
مانگ کراسی تریفە
مرۆڤیش کەوڵی حوزن

٤٠

لە چاوەڕوانی تۆدا
بووم بە کۆتەڵێکی خاپوور
کاتێ دێیت
تەپوتۆز لە باوەش دەگریت

٤١

سەرمایەداریی
دانە دانە لە قوتووی ناوین
هەموومان لە بازاڕدا
یەک نرخمان هەیە

٤٢

هیچ ئامێرێک
بۆ خۆکوشتن شک نابەم
رەنگە بە تاڵێک لە پرچی تۆوە
خۆم هەڵواسم

٤٣

ویستم دایکم
لەگەڵ خۆم بهێنمە مەنفا
هەرچەندم کرد لەگەڵم نەهات
دەستی کرد بە گیرفانی کەواکەیدا
وتی ها کورم بیگرە

ئەوە چنگێک گریان
دڵنیام پێویستت پێی دەبێ
٤٤
من لە فرمێسک کۆنترم
لە زەردەخەنە تازەتر
من لە دنیا کۆنترم
لە ژیان تازەتر
٤٥
هاوڕێکانم ڕۆشتن و نەمبینینەوە
ئەو ژنانەی بە بۆنی شیعرەکانم
مەست دەبوون
ڕۆشتنێک ڕۆشتن نەگەڕانەوە
هەور و باران و وڵات و یادەوەریی
چوار دەوریان چۆڵ کردم
بە تەنها خۆم بەدیار خۆمەوە مامەوە
٤٦
ڕژاوم
وەک پەرداخێ ئاو
لەسەر دڵی وشکی سەحرا
ئای چەند زوو وشک دەبمەوە!

٤٧

لە چلەی هاویندا

خەونی تەزیو دەبینم

لە ژێر تارای سپی بەفرا

خەیاڵ گڕم تێبەردەدا

٤٨

من گوڵێکم

لە باخی پرسیاردا

لە بیابانە چیمەنتۆییەکانی وەڵامدا

دەوەرێم

٤٩

گومان

درزی خاکێکی شەقبردووە

ئاوی بیرکردنەوەم دەخواتەوە

هێشتاش تینووە

٥٠

عەشقم

باخێکی دڵشکاوە

جگە لە ترۆزی تاڵی فیراق

هەناری ماچێک ناگرێ

٥١

شیعرەکانم بە کەم مەگرە
بۆ رامکردنی وشەیەک
سەرم کردووە
بە ئاوایی سەد قامووسدا

٥٢

رووناکییەکی نابینا
گەمارۆی داوم
رەنگە عەشق بێت

٥٣

لوغمێک
لە بن پێی ناوبانگمدا تەقییەوە
سەدان شیعر جوانەمەرگ بوون

٥٤

پایزی من
پایزێکی گەورەیە
دەیان پایزی بچووکی
لە باوەشدایە

٥٥

شوێنی من
سەر بورجی عاجی کارەسات و
بنی بنەوەی گۆمی غەمە

٥٦

زەمەن گۆڕاوە
چیتر تووی عەشق
ناوەڕێتە ناو هەستمان
کلو کلو ڕق دەبارێت

٥٧

هاتن
برینەکەمیان بە خوێن شتەوە
لە سوێراوێکیان هەڵکێشام و
پێیان گوتم
ئەمەیە عەشق

٥٨

زۆر شارم دیوە
زۆر شارم خۆشویستوە
هیچیان نەیانتوانی
وەک سلێمانی
ڕۆحم داگیر بکەن

٥٩

عەیامێکە بێ دڵ دەژیم

دڵم لە هیچ شوێنێ بزر نەبووە

ئارەزوومەندانە

لای ژنێک جێمهێشتووە

٦٠

دڵم لەسەر دڵت میقات کراوە

ئەمە ئەو نامەیە بوو

هەرگیز نەتخوێندەوە

٦١

ژیان

فرێی دامە دەرەوەی خۆی

مەرگ

بوو بە خانەخوێم

٦٢

لە چاپی تازەی تەوراتدا

خوا نوسیوویەتی

گەنجینەکانم شادیی تێدا نەماوە

هەوڵی دزینی مەدەن

٦٣

دەنگی گریانێک

شار لە خەو هەڵدەستێنێ

لە هەنسکدانی شاعیرێک دەچێت

٦٤

شاعیرێکی بە ساڵاچوو

وەک تازە هەرزەکارێ

پرچی ئەو شیعرانەی دادەهێنا

بۆ عەشق دەینووسین

٦٥

ئەی تەمووز[١]ی میهرەبان

لە جیاتی ئەو

خۆمم پێ ببەخشە

٦٦

هیچ زیندوویەک

هێندەی مردوویەکی

وەک کارل مارکس

زیندوو نییە

٦٧

هەوڵدەدەم

ستایلی شیعرم بگۆڕم

[١] تەمووز، خواوەندی بەخشین و میهر.

کۆمیدییانە
لە تراژیدیاکان بدوێم
٦٨
پشتم لێتانە
ئەی خێڵی چەپڵەلێدەر
ئەی ئەوانەی
بڵێسەکان دەکوژێننەوە
٦٩
شەوەکانی بەهەشت
سوور سوورن
دۆزەخنشینان
لە ئاخ و ئۆفیان شەرم دەکەن
٧٠
لە مێشکی درومانکراومەوە
گۆرانییەک هاوار دەکات
خۆشم ئەوێی
٧١
عەشق ژەهرە
تۆ دەیخۆیتەوە
مەعشوق دەکوژێ

٧٢
شارستانی چیتر شارستانی نییە
زانست چیتر زانست نییە
مرۆڤ چیتر مرۆڤ نییە
٧٣
حاجی قادر
کوردستانی لە کۆیە ون کرد
لە ئەستەمبۆل دۆزییەوە
٧٤
کتێبە ئاسمانییەکان
لە ئاسمانەوە نەهاتوون
لەسەر زەوی نووسراونەتەوە
٧٥
جیهانی تازە
سەتڵێک شەربەتی مێوژە
مشکێک تیایدا تۆپیوە
٧٦
ئەو عەقڵانییەتەی
دنیای ئەمڕۆی پێ بەڕێوە دەبری
پڕیەتی لە ناعەقڵانییەت

٧٧

زانستی نوێ
ڕێوشوێنێکی زانستییە
بۆ لەناوبردنی جیهان

٧٨

دوکەڵێکی چڕ
لە ناخمدا دایکوتاوە
ناوێرم بڵێم خەمۆکییە

٧٩

لە ڕێی شیعرێکی لاڵەوە
هاوار دەکەم
لیبیدۆیەکی سەرکوتکراوم

٨٠

ئەو بیر لە خۆی دەکاتەوە
منیش بیر لەو دەکەمەوە
یەکێکی تر لە من

٨١

چەپە رادیکاڵەکان
بە موگناتیسی فانتازیا
بەهەشت لە ئاسمانەوە
رادەکێشنە سەر زەمین

٨٢
داوای بەهەشت ناکەم
لەسەر زەوی
بە دۆزەخیش رازی نیم
٨٣
هیچ رووداوێک
لەلای من
هێندەی ناسینی تۆ
گەورە نییە
٨٤
عەشق کتێبێکە
هەر رۆژەی لاپەرەیەکی دەنووسم
پێدەچێ لە کۆتاییدا
بیسووتێنم
٨٥
ئەو کتێبانەی
باسی مرۆڤی دڵشاد دەکەن
نەنووسراون
یان دەمێکە فەوتاون

٨٦

مرۆڤ خۆی نابینایە

ئاوێنەکان خەتایان چییە؟

٨٧

پاشماوەی مەیمونەکان

رەفتاری مرۆڤیان بینی

لە تیۆری پەرەسەندن

پەشیمانبوونەوە

٨٨

ئەم رستەیە لە حەژمەتدا

روومەتی خۆی دەڕنێ:

کەس نەمر نییە

ژیان نامرێ

٨٩

نازانم لە مەرگدا

چی روودەدا

چیرۆکێک نامێنێت

بۆ گێڕانەوە

٩٠

هەر خەندەیەک لاپەڕەیەکە
لە پەرتووکە مەزنەکە
لە کتێبی گریان

٩١

لە دەفتەرێکی بچووکدا
پێدەچوو لە عارفێک جێمابێ
نوسرابوو
بێ مێشکانە بژین شکۆمەندترە
لەوەی بێ دڵ بمێنینەوە

٩٢

بێ ئەوەی خەون ببینن
ناویان لێناوم مۆتەکە

٩٣

لەسەر گردی ئێستاوە
لە داهاتوو دەڕوانم
لەشکری ڤیرۆس بەڕێوەیە

٩٤

لەو چرکەساتەوەی
جێمان بە خودا لێژ کرد
یوتۆپیای شادومانیش
هێندەی تر دوورکەوتەوە

٩٥

پەردەی وەهم بدڕن
ئەو دونیایە ببینن
لە نانێک دەچێ
کەڕو لێی داوە

٩٦

بیچمی سیاسەتمەداران
لە کاتی لێدواندا
لە دیمەنی زەڕافەکان دەچێ
لە بەردەم مایکرۆفۆندا

٩٧

خۆ ئێوە بەراز نین
جار جار
ئاوڕێک بدەنەوە
شیاکەی هەزارەها گوناهتان
ڕۆکردووە

٩٨

ئەم جیهانە
جەستەیەکی بێهێزە
شتێکی گرنگی کەمە:
ڤیتامینی خۆشەویستی

٩٩

کەس پۆرتریتی

ئەو جیهانەی بۆ نەکێشاوم

کە رەتی دەکەمەوە

١٠٠

لە رۆخی دەریا

لە کەڤاڵی ژن و پیاوە رووتەکاندا

داڵغەم گەڕاوەتەوە سەرەتای سەرەتا

بۆ پێش تاوانی یەکەم

١٠١

خۆم دادەپۆشم

تەنانەت لە کەنار دەریاش

خۆم رووت ناکەمەوە

نامەوێ کەس

بە برینەکانم پێبکەنێت

١٠٢

چیرۆکێکم هەیە

سەیرتر لە خەون

سەروتر لە خەیاڵ

پێناچێ بیگێڕمەوە

١٠٣
پێکەنین
موڵکی باپیرم بوو
لەو میراتە بێبەشیان کردم
١٠٤
چاوی خۆم نەدایتێ
بۆ فرمێسک
دڵی خۆم پێنەدایت
بۆ شکاندن
١٠٥
لەشم
نیشتەجێی ئازارە
رۆحیشم
لە هیچ شوێنێ نیشتەجێ نابێ
١٠٦
ئایکۆنە خۆشەویستەکانم
داپیرەم و باوکم
مارکس و هاینریش هاینە
شێخ عوبەیدوڵا و خانی
تەمی ناو بیرەوەریین
تاکە سوکنایيەک مابێ
ژنێکە، هەستم دەخوێنێتەوە

١٠٧
لە "کەو" دەچین
عاشقی ئەو تاڵیشکەین[١]
پێی دەوترێ ژیان
١٠٨
کراسێکی گوڵدارم لەبەردایە
گوڵێکیان لە شیعر
گوڵێکی تر لە فرمێسک
گوڵەکانی تریش لە عەشق
١٠٩
لافیتەیەکی توورە
بە ئەشکەوتی بیرکردنەوەمدا هەڵواسراوە
لەسەری نووسراوە:
تەنهایی
١١٠
یادەوەرییەکی خۆشم نییە
رۆژە تاڵەکانمی
پێ بخەمە پێکەنین
لەوانەیە لە شێتێکی
قەرز بکەم

[١] تالیشک: گیایەکی تاڵ و تفتە، زۆتر کەو حەزی پێدەکا.

١١١
خۆشەویستی بێمانایە
مەگەر کەسێکت خۆشبوێ
هیچ کەس خۆشی نەوێ
١١٢
بۆ ئەوەی سەرمەدییانە
لە دڵمدا بمێنیتەوە
ڕێم دا بڕوات
١١٣
مۆسیقارێ
چەنگی قورگم دەژەنێ
گریان پەرش و بڵاو دەبێتەوە
١١٤
لێتان خۆش نابم
دەستدرێژیتان کردە سەر
بووکی خەیاڵەکانم
١١٥
تاوێرتان گرتە
ئەو باڵەخانە شووشەییەی
لە خەوندا ئاوام کردبوو

١١٦
رووتتان کردمەوە
لە پۆشاکی فەنتازیاکانم و
وتتان برۆ بژی
تەرم دەتوانێ هەناسە بدا؟
١١٧
بە میکرۆسکۆب
سەیری ناوەوەی خۆم کرد
یەک پەڵەم نەدۆزییەوە
پووچگەرایی رەشی کردبێت
١١٨
لە سەردەمی کوێرییدا
رەشبینی
هەوڵێکی نەزۆکی بینین نییە
١١٩
ئێوە کێشەتان
لەگەڵ رەنگی رەش هەیە
بۆچی رێ نادەن
دونیا بە سروشتیی ببینم؟

١٢٠
کاپیتالیزم
سروشتی کونە رەشەکانی هەیە
هەرچی قووت بدات
دەرهاتنەوەی نییە
١٢١
تاریکایی
موگناتیسێکی جیهانییە
مرۆڤایەتی بەرەو خۆی رادەکێشێ
١٢٢
لەناو کتێبەکاندا
بە دوای عەشقدا دەگەڕام
کتێبەکانیش وەک من
عەودالّی بوون
١٢٣
رۆژنامەنووسان
دەمیان وەک زنجیری پانتۆڵەکانیان
داناخەن
ئەگەر لوقمێک نەخرێتە زاریانەوە

١٢٤
لە ئاسمانی نامووسەوە
چەقۆ دەبارێ
نوزەی هەنارێکی مێخۆش دێ
١٢٥
نائومێدیی
وەک گورگێکی برسی دەلورێنێ
هیوایەک نەماوە
بیکاتە نێچیر
١٢٦
مرۆڤ
دواین خەونی شامپازییەک بوو
١٢٧
نازانم بۆچی من و دونیا
هیچ کات بە تەنیشت یەکترەوە نین؟
جارێک دەکەومە پاشی و
دە جاری تر دەڕۆمە پێشی
١٢٨
شیعر دەگریا
بەسەر لاشەی ئەو واقیعەی
زیاد لە خۆی واقیعی بووەتەوە

١٢٩
دەڵێی دۆنکیشۆت گەڕاوەتەوە
جدیترین کەسەکان
قەشمەرترینیانن
١٣٠
شەمشەکوێرە هەوەسبازە
لە بری خۆر
عاشقی گەلە ئەستێرەیەک بووە
١٣١
پەپولە
هێندە بێ دەسەڵاتە
سامی لای منداڵێکی ساواش نییە
١٣٢
ئێمە چین
جگە لە گروپێک
ئەنیمەشینی وڕ و سەرخۆش
لە فەزای مەجازدا؟
١٣٣
چ رۆژێکە تێی کەوتووین
لە هەموو جێگەیەکین و
لە هیچ جێگەیەکیش!؟

١٣٤

هەرچی مرۆڤ دایهێناوە
وەهمێکی پەتییە
خودایە ئاژەڵێکی تر دروست بکە
هێندەی مرۆڤ وەهمساز نەبێ

ئەم تێکستانە سەرجەمیان لە دەرەوەی وڵات نووسراون، هەمووشیان لەسەر دەفتەری تێبینی رۆژانە یادداشت کرابوون، بەڵام بە پێی مێژووەکانیان ریزبەند نەکراون. تێکرایان لە ماوەی شەش ساڵێکدا بە شێوەی دانە دانە نوسراون. لە رووی زەمەنیشەوە دەکەونە نێوان مانگی ئۆگەستی ٢٠١٤ کە چاوەڕوانی نەشتەرگەریی بووم لە ئونی کیلینکی شاری کۆیلن، تاکو یانیوەری ٢٠٢٠ کە چارەسەری کیمیاییم لە نیوەیدا بوو، هاوکات سەرەتای دەرکەوتنی ئەو ڤیرۆسە هار و هەراشەش بوو، ناونرا کۆرۆنا "کۆڤید نۆزدە". لە پەنا ئەمانەشدا سەدان تێکستی هاوشێوە و دەیان قەسیدە و شیعر و وتار و چەندان کتێبم نووسی. ئەم چەند ساڵەی دواییش، ئەگەر نەخۆشی لە پێشکەوتنی فیکریی دوای خستبم، دەرفەتی پێدام ئەرشیفی نووسینەکانم ریک بخەمەوە.

ستیڤان شەمزینی

١

هەموو سوڕی ژیان
مەودایەکی کورتە
لە نێوان چاوهەڵهێنانێک و
چاوداخستنێکدا

٢

ئەوەی پێتدەڵێ
بیر لە مردن مەکەوە
زیاد لە هەمووان
زراوی لە ژیان چووە

٣

هەر کەس دەیەوێ
چارەنووسی خۆی ببینێ
گۆڕستانەکان هەن

٤

ئەوەی تەکنۆلۆژیا بەدەستی هێناوە
لای من هیچە
مادام مرۆڤێکی شاد لە ئارادا نییە

٥
شادترین مرۆڤ
گەر واز لە خۆفریودان بهێنێ
غەمبارترینە
٦
سەردەمی تەڵیسم بەسەرچوو
زانست
هەموو شتی رووت کردەوە
٧
ژیان
بایکۆتی کردووم
نەک لە نێو مشتیدا بفلیقێمەوە
٨
لێم دەسڵەمێنەوە
لەبەرئەوەی لە بری چارەسەر
بە دوای کێشەکانەدا دەگەڕێم
٩
"بوون"
پرسیارێکی بێوەڵامە
هەر لە "نەبوون" دەچێ

١٠
پرسيار مەكە
ژيان چییە؟
حەوت مليار وەڵام ئامادەیە
١١
خۆرهەڵاتییەكان
چێژ لە بێ چێژیی وەردەگرن
خۆرئاواییەكان
چێژیان بێ چێژ كردووە
١٢
زۆرێک لە ئێمە
تامی عەشقمان نەكردووە
تەنها بیستوومانە
١٣
دەڵێن عەشق چوالەیەكی تاڵە
من خۆم لە شیرینی دەپارێزم
یەكێكی تر شەكرەی هەیە
١٤
نارسیسێكی هەڵگەڕاوەم
لە هەموو ئاوێنەیەكدا
لە بری خۆم
تۆ دەبینم

١٥

هیچ مرۆڤێ

هێندە ئومێد کۆناکاتەوە

لێی ببەخشێ

١٦

رۆژهەڵاتییەکان

بۆ تەماشای خۆیان

لە ئاوێنەکانی خۆرئاوا دەڕوانن

وێنەی درندەیەک دەبینن

١٧

وەرگێڕێکمان دەوێ

برینە کۆنە قەتماغە نەبووەکان

تەرجەمە بکات

بۆ سەر زمانی ئەمڕۆ

١٨

ئەوە من نیم

لە بارەی غەریبییەوە دەدوێم

ئەوە غەریبییە لە من دەدوێ

١٩

هۆڵدەرلین و هیتلەر

گۆتە و ئایشمان

به یەک زمان
بیریان دەکردەوە
٢٠
وشەی جیاوازیی ،
بە ڕێکەوت کەوتووەتە
فەرهەنگی زمانەوانی کوردییەوە
٢١
مێژوو
ئەسپێکە لە غاردانەیە
بەرەو پێشەوە
٢٢
باوکم کوژرا
دایکم بە مۆڕەوە
سەیری کۆمەڵێ ژنی دەکرد
بە کوڵ دەگریان
٢٣
ئەگەر کەمێک زووتر
کۆندۆم داهاتبا
زۆرێک لە سیاسەتمەدارانمان
نەدەناسی

٢٤
بەفر باریوە
وردە وردە دەڕۆم
تۆش بە شوێن پێکانمدا دێی
دەگەیتە رۆخی رووبارێکی خەواڵوو
نەیزەکێک لە خەو هەڵیساندووە
ئاورِ دەدەیتەوە بە هەر لایەکدا
من لەوێ نیم
٢٥
بە ئەشکەنجەدان
ویستیان بمخەنە
قاوغی یەکێکی ترەوە
بڕیارمدا لە پێستی خۆما بمرم
٢٦
کۆرۆنا هەڵامەتێک بوو
دەردەکانی بچووک کردەوە
لە ترسی کۆڤید
شێرپەنجەم لە یاد نەما
٢٧
پزیشکەکە پێی وتم
زۆر ماندوویت لە ژیاندا؟

بە بزەیەکەوە وتم
ژیان گیرۆدە بووە بەدەستمەوە
٢٨
پزیشکەکە وتی
ژیان رقی لێ هەڵگرتوویت!
وەڵامم نەداوە
دەمزانی ژیان خۆشی دەوێم
ئاسان نامداتە دەست مەرگ
٢٩
مرۆڤ
هەموو شتێکی دۆزییەوە
بەڵام خۆی ون کرد
٣٠
زۆر جار
هەمان خەون دەبینم
باپیرم پێش باوکم بینیبووی
رەنگە باپیریشم
درێژەی بە خەونی باپیری دابێ
٣١
نامەوێ لە هیچ کوێ بمنێژن
جگە لە عاتیفەی گڕگرتوو و
چاوی پڕ پرسیاری تۆ

٣٢

بڕیارم دابوو

بتخەمە لیستی بیرچوونەوەوە

شیعرەکانم ڕێیان لێگرتم

٣٣

ڕۆژێک بیری لێ کردمەوە

جێیهێشتم

ڕۆژێک بیرم لێ نەکردەوە

سزای خۆم دا

٣٤

لەناو خۆمدا

بۆ منێک دەگەڕێم

لە عەشقدا نەخنکابێت

٣٥

ژنێک پیاڵەیەک عەشقی بۆ ڕاگرتم

ژنێک پیاڵەی عەشقی ڕشتم

پرسیارێکم لە خۆم یاساغ کردووە:

کامیانت خۆشدەوێ؟

٣٦

دەتوانیت

لە دڵی ئایندەتدا جێم نەکەیتەوە

حەزدەکەی چەند ساڵ
لە تەمەنت بسڕیتەوە؟
٣٧
خۆشەویستەکەم
هەموو گوناهەکانی بینیم
فرمێسکەکانمی نەبینی
ئەگەرنا نەدەڕۆشت
٣٨
بۆ ئەوەی بگەم بە تۆ
بەسەر شەقامی چەقۆدا
هەنگاوم نا
واتزانی پێم بە شوشەی
بیرەوەرییدا ناوە
٣٩
یەک جار درۆم لەگەڵ کردووی
ئەو رۆژەی پێموتی
ئیدی دوور لە تۆ
لەگەڵ خۆم دەژیم
٤٠
وەک جاران
لە رۆشتنت ناترسم
تەنیایی مارە دەکەمەوە

٤١

ئەقڵ و ئەشق

دوو خۆشەویستی منن

دانویان پێکەوە ناکوڵێ

٤٢

ویستت بە ماچێ

لەگەڵ ژیان ئاشتم بکەیتەوە

بەهار بە گوڵێ نایەت

٤٣

لەگەڵ دەرکەوتنی تۆدا

ڕۆژگاری ڕەشم

سپی هەڵگەڕا

٤٤

خەونێکی نەبینراوم

چاوەڕوانم

تۆ بمبینی

٤٥

بە هەموو کوێرەوەرییەکانەوە

چارەنووسی خۆم خۆشدەوێ

مادام تۆی تێدایت

٤٦
لە نێوان ئازادیی خۆم و
کەلەپچەکانی تۆدا
دووەمیانم هەڵبژارد
٤٧
شێتبوون
نزمترین پلەی عاشقبوونەوە
بۆ بینینی بەرزترین راددەش
سەیری تەرمی من بکەن
٤٨
رۆشتنت
گیراوەیەکی سوێر بوو
بۆم نەخورایەوە
٤٩
هێندە تامی دڵشکانم کردووە
چیتر خەونی نەوسن
بە عەشقەوە نابینم
٥٠
پێش ئەوەی دەعبای دووریی
هەنجن هەنجم بکا
پێمگووت تۆ نەبی

گورگی تەنهایی دەمخوا

٥١

لە دەرگای غەمەکانییەوە
منی کرد بە ژووردا
لە پەنجەرەی شادییەکانییەوە
فڕێیدام

٥٢

حەزدەکەم
ملیارەها رستە
لە نۆ حەرفدا کورت بکەمەوە و
بنووسم:
خ
ۆ
ش
م
د
ە
و
ێ
ی

٥٣
من بووم بە گیا
تۆ بوویت بە شەونم
من بووم لێو
تۆ بوویت بە بزە
من بووم بە تۆ
تۆ دووجار بوویت بە خۆت
٥٤
قاقا بە نامەیەکی دێرینم
پێدەکەنم:
"ئەگەر تۆ دەستم بدەیتێ
خۆم بە ژیاندا هەڵدەواسم"
٥٥
دڵشکان
دواهەمین ئایەتە
لە سورەتی عەشق
٥٦
بە گسکێک
پارچەکانی کۆکردمەوە
لە زبڵدانێکدا خۆم بینییەوە
ناوی لە بیرکردن بوو

٥٧

هیچ کات

تووشی سەکتەی دڵ نابم

چونکە دەمێکە لای خۆم نەماوە

٥٨

تۆ دەڕۆیت

جەنازەیەک جێدەمێنێت

هاڵاوی ماچەکانتی لێ هەڵدەستێ

٥٩

لە تەنیاییدا رۆچووم

تەنیایی لە مندا نغرۆ بووە

خوداش غیرە دەکا

٦٠

دڵم لە ژیانێک رەنجاوە

کە لەسەرو هەموو شتێکەوە رامگرتبوو

منی خستە خوار هەموو شتێکەوە

٦١

کاتێک فێربووم

تەڵیسمی ژیان بشکێنم

مەرگ هات

٦٢

داپیرەم

بە تەوسەوە پێی دەوتم

خۆزگە دەمزانی خەریکی چیت؟

ئێستاش وەڵامم پێ نادرێتەوە

٦٣

دایکم کە لێم توورە دەبوو

دەیقیژاند تۆ لە من نەبووی

لە داوێنی کتێبەوە هاتوویت

٦٤

فریا نەکەوتبام

ئایدۆلۆژیا

مێشکی قەڵەمەکەمی کلیل دەدا

٦٥

سەردەمانێ

مرۆڤ دیار نەبوو

دەیناسۆر فەرمانڕەوای جیهان بوو

٦٦

لە جەنگدا بە دیل گیرام

سەربازێ نیگایەکی کردم و

دەستی بۆ من ڕاکێشا

بە سەرسوڕمانەوە بە ئەفسەرەکەی وت:
گەورەم ئەم جەنازەیە گوللەباران بکەم؟
٦٧
هیچ گالیسکەیەک
رامناکێشێت بەرەو دوورگەی ئاینده
شیعر یان خۆکوشتن نەبێ
٦٨
ئەو چرکەساتەی
ئینجانەکانی ژیانم ئاودەدا
تا گوڵێکی تری تەمەن بگرێ
دڕکی مەرگ چوو بە رۆحما
٦٩
باوکم ئاوێنەیەک بوو
خۆم تێدا دەبینی
دواتر تێگەیشتم
ئاوێنە هەقیقییەکە دایکمە
٧٠
کەس دەرک
بە قووڵاییەکەم ناکا
لەبەرئەوەی ئەوان من نین

٧١

فرمێسک

زنجیرەیەک وشەی لاڵە

لە بری دەم

لە چاوەوە دەردێ

٧٢

هێندە کزم

هەر لەو مۆمە دەچم

بەرگەی فوویەک ناگرێ

٧٣

بە دوای خوادا گەڕام

لە هیچ مەڵبەندێ نەمدۆزییەوە

بەڵام لە خوا گرنگترم ئاشکرا کرد:

خودی خۆم

٧٤

عەشق خۆی رادەپسکێنێ

دەیەوێ بچێتە دەرەوەی ئەو زەمەنەی

چەشنی پیرەپیاوێک پشتی چەماوەتەوە

٧٥

خوداش بنوێ

دڵی من ناخەوێ

تەزبیحاتی ناوی تۆ دەکات

٧٦
ئەوەی بە ساوایی دەمێنێتەوە
تەنها و تەنها عەشقە
نە پیر دەبێ و نە دەمرێ
٧٧
گیرۆدەی کەللەی خۆمم
من ئازاد نیم
دیلی تۆپێکی رەقم
٧٨
مەحاڵ
ئیدیۆمێکی بوغزاوییە
داهێنراوی هزری دەستەمۆکانە
٧٩
مرۆڤ بەرەو پێشەوە ناڕوات
ئەگەر وا بوایە
ڕێی کاکێشانمان بڕیبوو
٨٠
شاعیرێکی گومانکارم
زۆر جار گوێ بۆ هەناسەم شل دەکەم
تا دڵنیابم لە زیندووبوونم

٨١
دیموکراسی
ڕێستۆرانێکی رۆژئاواییە
یەکێک لەو خواردنانە هەڵدەبژێری
لە مینۆکەیدا هەیە
٨٢
فۆتۆیەکم گرت
لە بری دەموچاوی
ناخی ئەدرەوشایەوە
نەمزانیبوو هێندە جوانە
٨٣
ئەگەر شێرپەنجە نەبوایە
بالآم هێندە بەرز دەبوو
گلۆپی ئەستێرەکانم دەگۆڕی
٨٤
عەشقی تاکلایەنە
ناشرینترین جوانییە
خۆم بەسەرم هاتووە
٨٥
هیچ مرۆڤێ
بە پیربوون ناشرین نابێ
جوانییەک دەمرێ
جوانییەکی تر چاو دەکاتەوە

٨٦
کاپیتالیزم
نەک هەر تێڕوانینەکان
بەڵکو دەموچاوی هەمووانی
یەکخست
٨٧
لە سایەی نۆڕینگەکانی جوانکاریی
هەموو ژنانی دنیا
دەتوانن بە یەک پاسپۆرت
هاتوچۆ بکەن
٨٨
هەموو دژی ناشرینین
کەچی باکمان نییە
لە ناشرینکردن
٨٩
خوشکە گەورەکەم
سەیری وێنەکانی کچێنی خۆی دەکرد
ئەوەی سەیرە
دوای سی ساڵ
ئێستا گەنجتر خۆی دەنوێنێ!

٩٠
بەلای سیاسەتمەدارێکی شیکپۆشدا
تێپەڕیم
لە بن پێستییەوە بۆگەنێک دەهات
بە عەترە گرانبەهاکانی نەدەشاردرانەوە
٩١
خۆشم هەستی پێدەکەم
شیعرەکانم کورت بوونەتەوە
وەک عەشق
رەق و تەق بوون
وەک ژیان
٩٢
کرمی بێهودەیی تێیداوم
ژیان بەلامدا تێدەپەڕێ
سڵاو ناکات
عەشق بە بەردەمما رەت دەبێ
چاوێک داناگرێ
٩٣
لە دەریایەکی رەشدام
چڵێکی رووناک نابینم
نائومێدانە دەستی ئومێدی

بۆ درێژ بکەم
وای
شەپۆلی تاریکی بردمی

٩٤

هیچ مرۆڤێ ئەوەندە شانسدار نییە
جێی ئیرەیی بێت
هەر ئەوەی لە دایکبووە
بۆ خۆی بەدبەختییە

٩٥

رەشبینی لە وجودی مندا
وەرزێک نییە
ئۆتیزمێکی ئەبەدییە

٩٦

گەشبینی
ماسییەکی زۆرزانە
نابێت بە قولابەکەمەوە

٩٧

هەر کە دەرگای گەنجیم کردەوە
رەشبینی
بە چەپکێک تاریکییەوە
خۆی کرد بە ژووردا

٩٨

ڕەشبینی هاوڕێمە
بیرم نایەت لە هیچ تەنگانەیەکدا
جێیهێشتبم

٩٩

وتیان لەو پەنجەرە تەڵخەوە
سەیری دونیا مەکە
پەنجەرەکەم سڕییەوە
دونیا تەڵختر بوو

١٠٠

کە لە دایکبووین
هیچمان نەبوو، هیچ هیچ
ئەوەی پێمانبوو بە تەنێ ژیان بوو
خەمی ئەو ژیانەمە

١٠١

ئەگەر مێشکم
چەند گرامێک سووکتر بوایە
یان "ئای کیو"ەکەی نزمتر بوایە
کێشەکانم چارە دەبوون

١٠٢
شێتییەک لە ناوەوەمدا
حاڵ گرتبووی
رێم دا دەفی عەشق بژەنی
١٠٣
ئەوانەی مەراقیان
تکتێکی خێرایە بەرەو بەهەشت
دۆزەخ لە دوای خۆیان جێدەهێڵن
١٠٤
سەیری رۆژژمێرەکە دەکەم
وەک عەرەبانەیەک
پاڵ دەنێم بە کاتەوە
بەرەو ژوانی چاوەڕێکراو
١٠٥
هیچ رووناکییەک
وەک من پرشنگدار نییە
هیچ تاریکییەکیش
هێندەی من نەفرەتباران نەکراوە

١٠٦

ماڵێکی شووشەییم ئاوا کرد
عەشقت وەک گاشەبەردێک
لە چیای دڵتەوە خلۆر بووەوە و
خۆی کرد بە ژووردا

١٠٧

باسی ئارەزوو دەکەم
جەستەت دوور دوور دەکەوێتەوە
باسی عەشق دەکەم
دڵت نزیک نزیک دەبێتەوە

١٠٨

من ماسییەکی عاشقم
بە هەڵە بووم
بە تۆڕی عەقڵەوە

١٠٩

هەر تۆوێکم
لەو ئینجانە سپییەدا چاند
گوڵی ڕەش
سەری بەرز کردەوە

١١٠
بەم زستانە شەختەیە
گەشبینی
کراسی تەمێکی تەنکی لەبەردایە
رەشبینی
قەمسەڵە چەرمە قەترانییەکەی من
١١١
جارێک نوسیبووم
رەشبینی چەشنی سەرەتان
بە وجودما بڵاوبووەتەوە
خێرا ئەو دێڕەم رەش کردەوە
نەمویست دوا برادەرم زویر بکەم
١١٢
هەموو گیانم
جێ چنگی گەشبینییە
رەشبینی
بە هێمنی دەیلێسێتەوە
١١٣
لە زووەوە
گەشبینی جێیهێشتووم
لەم پایزی عومرەدا
بیشیبینم نایناسمەوە

١١٤

ئاگری ڕەشبینی
سەرتاپای کردووم بە گڕ
بەو فوە ناسکانەی گەشبینی
ناکوژێمەوە

١١٥

لە شەو دەچم
بەو هەموو تاریکاییەوە
ملیۆنان ئەستێرە
لە سینگما ئەدرەوشێنەوە

١١٦

هەزاران جار
لە مەملەکەتی گەشبینی
دیپۆرت کرامەوە
ناچار بووم بە هاوولاتی
لە هەرێمی ڕەشبینیدا

١١٧

هێندە ڕەشبین بووم
پێموایە کە دەمرم
هیچ گۆڕستانی وەرمناگرێ

١١٨
دواجار بڕیارم دا
ئەو مەکربازە بکوژم
پێنج فەرزە دڵم دەشکێنێ:
گەشبینی
١١٩
ئەگەر تۆ پێتوایە
ئەم کتێبە خراپ بوو
ناچار نەبوویت
تا ئێرە لەگەڵیدا بێی
١٢٠
لە دوا دێڕ و
لەگەڵ خاڵی کۆتایی
هەر کتێبێکدا
نووسەر ڕۆحی هەڵدەفڕێ
ئیدی من لێرەدا مردم

بڕگەی یەکەم تاکو بڕگەی بیست و شەش لە هەفتەی یەکەمی مانگی یولی ٢٠٢١دا نوسراون. بڕگەی بیست و حەوت تاکو بڕگەی چل و شەش، لە هەفتەی سێیەمی مانگی یولی ٢٠٢١دا نوسراون. بڕگەی چل و حەوت تاکو بڕگەی حەفتا و دوو لە هەفتەی دووەمی مانگی ئۆگەستی ٢٠٢١دا نوسراون. بڕگەی ژمارە حەفتا و دوو تا بڕگەی نەوەد و نۆ لە سەرەتای سێپتامبەری ٢٠٢١دا نووسراون. بڕگەی نەوەد و نۆ تا دوا بڕگە لە ڕۆژی ٢١-٩-٢٠٢١دا دوماهیی بە نووسین و پاکنووسی هاتووە.